# کاروان

گۆڤاریکی رۆشنبیریی مانگانەیە

ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان بە زمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

سەرنووسەر
**محمد أمین محمد احمد**

جیگری سەرنووسەر
**حسین عارف**

**45**
**حوزەیران ١٩٨٦**
**ساڵی چوارەم**

## لەم ژمارەیەدا



ئەدرەس :
هەولێر : ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری «کاروان» ت : ٢٠٨٨٢

نرخی (٢٥٠) فلسە

لە کتیبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە «٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٢»ی دراوەتێ
لە چاپخانەی (الادیب البغدادیة) چاپکراوە

# سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکەی کورد لە ساڵی ١٨٨٠ دا

نوسینی : دوکتۆر جەلیلی جاسم
د . کاوس قەفتان لە رووسی‌یەوە
وەری‌گێڕاوە .

ئەو تەنگ‌و چەڵەمە سیاسییەی . لە ئەنجامی شەڕەکەی نێوان رووسیاو تورکیا ، تووشی تورکیا بوو . دۆخێکی ئابووری رووخاوی پەککەوتووی بەدووای خوێدا هێنا . کردەوە جەنگییەکان کارێکی تەواو خراپیان کردە سەر دۆخی ئابووری دوچە رۆژ هەڵاتییەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی .

بەزۆر سەربازگرتن‌و کزبوونی ژمارەی هێزی پیاوانی کارکەر . بووە هۆی ئەوەی ژمارەی جووتیارەکان تەواو بێتەخواری‌و ناحەزی‌و نارەزایی جەماوەری جووتیارەکان تێن‌بسێنی‌و بەرەو راستبوونەوە هانیان بدات .

لە ئەنجامی شەڕەکە ، ئابووری وولآت کەوتە دوخێکی وەها شکستەوە ، ناچاربوو تا رادەیەکی زۆر خۆی بخاتە باوەش سەرمایەی بێگانەوەو ببکاتە پاڵپشتی خۆی . ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە ساڵی ١٨٧٩ دا بەتەواوەتی نابووت‌بوو . بەهۆی زۆرلێ کردنی دەوڵەتە رۆژ ئاواییەکان سوڵتان ناچاربوو (مەرسوومی موحەرەم) بلاوبکاتەوە[١] . ئەمەش بریتی‌بوو لە رێککەوتنێکی ناهەموارانە لەگەڵ خاوەن قەرزەکانیدا . لە ساڵی ١٨٨١ وە کە بەڕیوەبەرایەتی «قەرزدانەوەی دەوڵەتی عوسمانی» دامەزرا ، لەوساوە تورکیا بەرەسمی کەوتە ژێرچنگی دارایی جیهانییەوە . وولآتە خاوەن (بەریتانیا ، فەرەنسا ،

ئەڵمانیا ، نەمسا ، مەجەر ، ئیتالیا) ، مافی تایبەتی و ئیمتیازاتیان لە تورکیا وەرگرت .

کاربەدەستان بۆ ئەوەی خەزینە عەتاڵ و بەتاڵەکە پڕبکەنەوە ، کەوتنە بەرزکردنەوەی رادەی باج سەندن . لە تەك باج سەندنیشدا ، زۆرداری لە خەڵکی کردن و رووت کردنەوەیان لەلایەن مووچە خۆرە تورکەکان دەرەبەگەکانەوە دەستی پێ‌کرد . شتێکی سەیر نەبوو جارەهای جار رووبدات کاربەدەستانی تورك داوا لە جووتیارەکان بکەن بەرهەمی ساڵی داهاتوویان بدەنی[٢] . بۆنموونە ئەمەیان لەگەڵ هەرێمی باشقەلادا کرد . هەرچەندە شوێن و ناوچەی وەها هەبوو ژمارەی مەڕومالأت تەواو کز بووبوو ، بەلام کاربەدەستان لیستە کۆنەکانیان ئەخوێندەوەو بەپێی ئەو لیستانە باجی مەڕو مالاتیان ئەسەند[٣] . لەوەش زیاتر بێ بەزەییانە رادەی باجەکانیان بەرزئەکردەوەو ماوەی کۆکردنەوەشیان کورت‌تر ئەکردەوەو ژمارەی مەڕو مالأتیان گەلێك لەوە زۆرتر دائەنا لە راستیدا هەبووو موڵك و باجی زەوی بەروبوومی و باجی تریشیان دووقات ئەکرد[٤] . لە ئەنجامی رووتاندنەوەو خوێن‌مژینی بێ رادە ، ئابووریە لاوازەکەو ئەو کشتوکاڵەی کوردو ئەرمەن کە هەر رۆژە لە بارێك‌دا بوو ، تەواو تیاچوو . گەلێك لە جووتیارەکان لەتاوا بوونە کرێکار لای خاوەن زەویە گەورەکان یان لای خان و بەگە کوردەکان ، ژمارەیەکی تریشیان بۆ ئیش و کار دۆزینەوە روویان کردە شارەکان . گوندەکانی خۆیان بەجێ ئەهێشت ، بۆ ماوەی چەند مانگێك بگرە بۆ چەند ساڵێك بەئاوارەیی ئەژیان . کوردەکان لە گەلێك هەرێمەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە نیشتمانیان بەجێ‌هێشت و هی وەهایان هەبوو روویانکردە باکۆو بتلیس وشارانی تر . بۆنموونە زوربەی ئەو کوردانەی روویان‌کردە بتلیس لە کوردەکانی ناوچەی مووش بوون . « . . ئەگەر پرسیارت نەکردایە ئێوە کوێندەرین ؟ رۆژنامەی (مشاك) لە یەکێك لە هەواڵەکانیا ئەنووسێت — بە زەحمەت ئەزانرا ئەوانە کوردن و ئەرمەن نین . هەژاری و عەوداڵ بوون بەشوێن پاروویەك ناندا لە یەکی نزیك کردبوونەوەو هاوجۆرییەکی وەهای دابوونی و کردبوونی بەبرای هاو دەردی یەکتر بەرادەیەك لە یەك جیا نەئەکرانەوە»[٥] .

دام و دەستگاکەی تورکیا لەوەدا نەبوو وولاتەکە بەرێوەبەرێت . خراپەو سەرکێشی‌کردن لە ئاست یاسادا تەشەنەی کردبوو ، دارزاندن دابوویە لەشی دەوڵەت . یاکیمانسکی یاریدەدەری کۆنسوڵی رووسیا لە دیاربەکر لە راپۆرتەکانی یەکەمیا هەمان راستی ئەخاتە بەرچاوو ئەوە رائەگەێنێ کەدام و دەستگای بەریوەبردن لەهەرەس هێنانێکی تەواودایە . بەواتەی ئەو سەرچاوەی هەموو ئەو خراپی و زۆرداری و دڕندایەتییە ، عیزەت پاشای موتەسەریفی گشتی هەرێمەکە بوو .

«پیاوێکی ئەسکەرییە ، جگە لەوەی لەهیچ مەیانێکی رۆشنبیریدا شارەزانییەو دەستی ناروات ، بەریوەبەرێکی تەواو بێ تەجروبەشە لەوانەش زیاتر بەئاشکرا رەشوەت وەرئەگرێ .»[٦]

مووچەخۆرەکانی ژێر پلەی موتەسەریف ، خراپ‌ترو دڵ رەقانەتر لاسایی‌کردەوە نارەواکانیان ئەکردەوە . دام و دەستگا قەزاییەکانی هەرێمی دیاربەکر لەدووا پلەی بێ رەوشتیدا بوو . تاوان بارەکان هەرگیز ئەیان توانی بەرەشوەت دانێکی چەور خۆیان لە سزادان رزگار بکەن . هەر کێشەیەك دوورایی لەسەر بووایە ، ئەو لایە ئەیبردەوەو رزگاری ئەبوو رەشوەتێکی زۆرتری بدابایە .

ئەوەی پێویستایە ببێتە قازی ، ئەبوو رەشوەتێکی باش بدات . گومانیش لەوەدا نییە هەموو قازییەك دڵنیابوو لەوەی

زۆر له شوێنەکەی خۆیدا ئەمێنێتەوە . لەبەر ئەوە بە هەموو جۆرێك هەوڵی ئەداو هەموو ڕێ‌و شوێنێکی خواری ئەگرت تا خێراتر گیرفانی پڕ بکات .

وەنەبێ ئەم دۆخەش لە دەستگانی سەر بە پۆلیس‌و سەربازیدا باشتر بووبێت . بەشێك لە هێزە سوپاییەکانی تورك پاش شەڕەکە تواناو هێزی جەنگاوەرییان نەما . خراپە کردن‌و ڕووت کردنەوەو تالانکردنی دانیشتووانی سەرڕێی سەربازەکان . ئەوەندە دوو بارە ئەبوونەوە . بووبوونە خووو دەقی خۆیان وەرگرتبوو .

لە ساڵی ١٨٧٩دا . دانیشتووانی هەرێمی دیاربەکر . لای کاربەدەستان شکاتیان لەدەست درێژی‌و کردەوەی نارەوای هێزە نیزامی‌و غەیرە نیزامییەکان کرد . ئەو ڕادە نزمەی بێ جڵەوییەی لە سوپادا هەبوو . بەزۆری بەهۆی نەبوونی ئۆردووگاو جل‌و بەرگ‌و پێکی مانگانە دانەوە بوو .

سەرەرای ئەو دۆخی داراییە سەختەی وولات کەوتبووە ناوی . کەچی کۆشکی سوڵتان . پارەو پووڵێکی زۆری بۆ خۆش‌و رابواردنی خۆی خەرج ئەکرد . موتەسەریفی هەرێمەکانی ڕۆژهەلات زۆر جار بە برووسکە فەرمانیان بۆ ئەهات بەگورجی مەبلەغێکی نیشانکراو بۆ ئەستامبوول بنێرن . بەو نیازەی بۆ ئەم یان ئەو پێویستی کۆشك خەرج بکرێت . ئەوەبوو لە ساڵی ١٨٨٠ دا . کاتێك گشت هەرێمی ئەرزڕوم تووشی دەردی برسێتی بووبوو . والییەکەی برووسکەیەکی بۆهات . داوای لێکرد خێرا پانزە هەزار لیرە بۆ کۆشك ئامادەبکات . برووسکەیەکی تری وەهاش بۆ سەرداری تەرابزوون نێردرا[٧] .
بەهۆی بەتاڵی خەزێنەوە . جەندەرمەو پۆلیسەکان بۆ ماوەی چەند مانگێکی زۆر مانگانەیان وەرنەگرت[٨] . کاربەدەستان ئاوریان لە ناوبردنی دزی‌و جەردەیی‌و ڕووتکردنەوە نەئەدایەوە . ئاگان لەوەبوو چۆن قازی‌و سەردارەکان ئەکرێن .

بەهۆی ئەو دۆخە داراییە قورس‌و ناهەموارەی پەیدا بووبوو . هەروەها لە ئەنجامی پەرەسەندنی ئازادی میللەت‌و پاش ئەوەش دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان سەریان کردبووە سەر کاربەدەستانی تورکیا . ناچاربوو بەڵێن بدات . دەستێك بە هەرێمە ڕۆژ هەڵاتییەکاندا بهێنێ . دانیشتووانی ئەو ناوچانەش . کە لە ئەنجامی شەڕەکەو دڵ ڕەقی‌و درندیەیەتی دەوڵەتەوە نابووت بووبوو تەواو پەکی کەوتبوو . بەچاوێکی پڕ لە هیواوە چاوەڕوانی ئەو دەست پیاهێنانە بوو .
بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی ئەو نیازو خواستانەی بۆ دانانی پرۆژەیەکی دەست پیاهێنان لە بەردەستدا بوو . لە نیوەی یەکەمی ساڵی ١٨٧٩ دا لیژنەیەك پێك‌هات بریتی‌بوو لە عەبدین پاشاو ماناس ئەفەندی . ئەم لیژنەیە نێردرا بۆ ئەرزڕۆم‌و خارپوت .

بەڵام لیژنەکە بەشی بێ کارییەکی تەواوبوو . لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەبوو هات‌و چۆکردنی لیژنەکەو دەست‌و پێوەندەکانی بووە بارو ئەرکێکی قورس‌و گران بەسەر دانیشتووانی ئەو ناوچانەوە .

بەکر پاشاو ئەسکەندەر بەگ بەنیازی تەماشاکردن‌و لێکۆڵینەوەی دۆخی هەرێمی دیاربەکر . نێردران بۆ ئەوێ . سەعید پاشا (کۆنە موتەسەریفی تریپۆل)و سولەیمان پاشای (عەقیدی دەریایی‌و یاوەری سوڵتان) پاڵکوفنیك شاکر بەگ . ئەوەی لە سوپای فەرەنسیدا خزمەتی کردبوو . پاڵکوفنیك تایەر بەگ . ئەوەی شەش ساڵ لە سلکی دیبلوماسی بوو لە هندستان‌و دوو سالیش لە چین‌و کاپتەنی ماورەکوردات . مولازیم یوسف بەگ‌و شیڤێری ئینگلیزی‌و گ . بیرگیپی سکرتێر[٩] . ئەمانە پەشداری لیژنەکەی بەکر پاشایان کرد .

لیژنەکە لە شوباتی ساڵی ١٨٨٠ دا گەیشتە دیاربەکر . بەڵام لە راستیدا هیچی بە هیچ نەکرد . لیژنەکە سێ مانگ لەوێ مایەوە ، دووایی لە رێی مووسڵەوە چوو بۆ بەغدا . موتەسەریفی گشتی کە دی خەزێنەی ولایەتەکە بەتاڵەو بۆ ئەوەی خەرجی لیژنەکە تامین بکات ، ناچاربوو بکەوێتە فرتو فێڵ پەنابەرێتە بەر رێگای خوارو خێچو زۆر لیٚکردن ، هەتا بتوانێ باجی دوواکەوتوو کۆبکاتەوە[١٠] .

بەواتەی یاکیمانسکی یاریدەدەری کۆنسوڵی رووسیا لە دیاربەکر ، گەلێك لە ئەندامانی لیژنەکە باوەریان وابوو قەت پێیان ناکرێت دۆخی ناوچەکە چاكبکەن ، بەڵام بەپێی ئامۆژگارییەکانی ئینگلیز ئامانجی ستراتیجی گەورەیان هەبوو[١١] .

پێویستە ئەوە دەستنیشان بکرێت کە ئینگلیز لەم ماوەیەدا بێ ووچان هەوڵی ئەدا دەست بخاتە کاروباری سوپاو جەندرمەی تورکیاوە . بەریتانیا کە باش ئاگاداری توانای جەنگاوەری سەربازی سوپای تورك بوو ئەیزانی تا چ رادەیەك نزمەو بەرەڵلای چەند لە ناویان بڵاوە ، هات خزمەت گوزاری خۆی خستە بەردەمبەو نیازەی رادەی تاعەتو رێكو پێکییان بەرزبکاتەوە . کۆشك ئەم پێشنیارەی بەدڵ بوو . لە شوباتی ساڵی ١٨٨٠ دا ، کاپتەن نۆرتۆنی ئینگلیزی لە مووشەوە بەرەو بتلیس کەوتە رێ . لە ئەرزرۆمیش کولۆنیل کووپ روتبەی سەرەك موفەتیشانی جەندرمەی ئەو ناوچانەی پیٚدرا[١٢] .

نە هەوڵو تەقەلای ئینگلیز ، نە کۆششو چالاکی لیژنەکە بۆیان نەکرا ، دۆخی ئابووری رووخاو دۆخی بەریوەبەرایەتی شێواوی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی باشتربێت یان بگرە بەهێزتر نەبێت . لە زستانی ساڵی ١٨٧٩–١٨٨٠ دا برسێتییەکی قورس زوربەی هەرە زۆری هەریمەکانی رۆژهەڵاتی تورکیای گرتەوە . لە مارتی ساڵی ١٨٨٠ دا رۆژنامەی (تایمس) هەواڵێکی بڵاوکردەوە کە لە ئەستەمبووڵەوە پێیگەیشتبوو تیایا هاتبوو : «هەژاریو برسێتی لە دیاربەکرو مووسڵ تەواو پەرەیان سەندووە ، دانیشتووانی دەوروبەری مووسڵ ، لە هەموو وەسیلەیەکی ژیانو بوون بێ بەشن ، بەڵام هیوا هەیە بەرهەمی داهاتوو دۆخی لیٚقەوماوەکان باشتر بکات .»[١٣]

لە ئەنجامی بێ بارانیو نەبوونی دەغڵو دان نرخی نان زۆر بەرزبۆوە . کاربەدەستانی ناوخۆیی ، ئەوانەی بازرگانێتیان بە پارووی میللەت ئەکردو دەستیان لە بازاری رەشدا هەبوو هەوڵیاندا هێندەی تر دانیشتووەکان برووتێننەوەو خوێنیان بمژن . ئەوەبوو حەسەن پاشای سەرداری هەکاری ، نزیکەی ١٢ هەزار[١٤] کیلۆ گەنمو جۆی لە عەمارەکانی واندا هەبوو . ئەو حەسەن پاشایە گوێی لە داخوازی دانیشتووەکان نەگرتو رازی نەبوو ئەو گەنمو جۆیەیان بەقەرز بداتێ . بەڵام دووای ئەوەی دەمی بە رەشوەتێکی گەورە چەور کرا ، رازیبوو هەموو ئەو گەنمو جۆیە بە نرخێکی هەرزان بدات بە قاچاغ چییەکان[١٥] .

ئەوانەی دەسەڵاتیان بە خوارو خیچی بەکار ئەهێنا ، لە هەریمەکانی تری ووڵاتیشدا هەڵیان ئەدۆزییەوە . بۆ نموونە مووچەخۆرە تورکەکان لە خارپووت (٣٠) هەزار کیلۆ گەنمو جۆیان بە قاچاخ چییەکان فرۆشت ، ئەوانیش لە دووایيدا بە دووقاتو چوار قات بەخەڵکیان فرۆشتەوە[١٦] .

ئەنجامی بەرزبوونەوەی نرخی نان ، وەك ئەنجامی شەرەکەو بێ بارانی بوو . ئەوەبوو هەژاری بێ رادەو برسێتی دەردو نەخۆشی بەدوای خۆیانا هێنا . بۆنموونە دیزانتیریا لە هەکاری تەشەنەیکرد . کاربەدەستانی تورك لەوە تۆقان نەخۆشییەکە تەشەنەبکات ، بۆیە خێرا لە ئەرزروومەوە (لافویان)ی پزیشکیان نارد بۆ ئەوێ ، ئەویش بڵاویکردەوە کە زیاتر لە دە هەزار کەس لە هاکاری لە تاو برسێتی مردن . دانیشتووە کوردەکان لە هەمووان زیاتر ئەم دەردەیان چێشت[١٧] . (لە

هەکاری ئاسووریش هەن – وەرگێر) .

ڕۆژنامەی (مشاك)ی . تفلیسی لە ساڵی ١٨٨٠ دا . هەموو ڕۆژ هەواڵی برسێتی ئەم ناوچە یان ئەو ناوچەی تورکیاو ئێرانی بلاو ئەکردەوە . بەئەو پەڕی تراگیدایاوە لە دۆخی هەژاریو برسێتی ئەرمەنو کوردەکان ئەدووا . «برسێتی – مشاك ئەنووسێت – پەرەئەسێنێ . خەڵکی لە هەموو شوێنێك ڕەشو ڕووتو هیلاكو لەڕو پەککەوتەن . لەتاو دەردو نەخۆشو برسێتی پێستیان بە ئێسکییانەوە نووساوە . بە شەقامەکاندا ئەسووڕێنەوە بەهاناسکە برکێوو نزگەرەوە . بێ وەستان داوای یارمەتی ئەکەن . گەلێك لە برسانا مردن[18] .

«لە هەرێمی باشقەلاً بەلای کەمەوە دە هەزار کەس مردن . دوو هەزار تا سێ هەزاریش لە بایەزیدو ئالاشکێرت تیاچوون . ژمارەیەکی وەهاش لە ناوچەکانی میدیاو بۆتانو جزیر لەناوچوون . باسی سەدەها کەسانیش ئەکرێت کە لەڕێگاو بانەکاندا بەلاداهاتن»[19]

دۆخی نیمچە کۆچەرو دانیشتووەکانی کوردستانو ئەرمینیا بەجۆرێکی تایبەتیو جدی کاریانکردە سەر ئەستەمبولو ناچاریانکرد لە سەرەتای ساڵی ١٨٨٠ دا . یاسەیەك دەربارەی کەمکردنەوەی نرخی پارە بلاوبکاتەوە . خەڵکە برسیو هیلاكو خوێنمژراوەکە ڕایەکی تەواو خراپیان بەرامبەر ئەو یاسایە پەیداکرد . «لە بارەی ئەمەوە پێویستە ئەوە ڕوون بکرێتەوە – یاکیمانسکی لە دیاربەکرەوە نووسی – جووتیارەکان . بەتایبەتی کۆچەرەکانی کوردستانو میسۆپۆتامیا . لەکەروبەری ڕۆژانەیانا ئەم پارە بێ نرخە بەکار ئەهێننو پارەی زێڕو زیو دروستکراو ناناسنو هەر نەیان دیوە»[20] . ئەبێ ئەوەش دەستنیشان بکرێت . کە خەزێنەی هەرێمەکان بەنهێنیو لەپێشەوە ئاگاداری ئەوە کران کە نرخی پارە کەمئەکرێتەوە . جا پێش ئەوەی یاساکە بلاو بکرێتەوە . زوو کەوتنەخۆیانو هەموو پارەو پوولە مەعدەنەکانیان گۆڕییەوە . ئیتر کە یاساکە دەرچوو ، خەزینەکانی میری پارەو پوولی مەعدەنییان تیادا نەمابوو . جگە لەمەش هەموو ئەو خەزێنانە پارەیان بەنیوە نرخ لە خەڵکی وەرئەگرت بەمەرجێك لە مانگی نیسان تێنەپەڕێت . بەکورتی ئەم پارە گۆڕینەوەیەو نرخ کەم کردنەوەیەی سەرومڕ لەسەر حسابی زەحمەت کێشان بوو .

میللەتیش وەلامی ئەم هەڵخەڵەتاندنو دەستبڕینەی میری بەراپەڕینو ڕاستبوونەوەیەکی چەکداری ڕووبەڕوو بداتەوە .

کوردە برسییەکەش دەست بە چەکەوە پەلاماری عەمارەکانی گەنمو جۆی داو مووچەخۆرە دەوڵەمەندەکانی کوشتو سەرکێشانە ڕووبە ڕووی ئەو هێزە تورکانە وەستا کە بۆ تەمیکردنیو باج کۆ کردنەوە نێردرانە سەری . ئەوەبوو کوردەکانی ماردین بەزۆر (٥٠) کیلە گەنمو جۆیان لە (جیلۆ) ناوێك زەوتکرد کە لە بازاڕی ڕەش نان فرۆشتندا ئیشیئەکرد . بەهۆی ئەمەشەوە چوونە مەیانی شەڕێکی قورس دژی سەربازە تورکەکان[21] .

دۆخی ژیانی دانیشووانی جزیرەو دیاربەکرو مووسلو ناوچەکانی تریش لەمە باشتر نەبوو . یاکیمانسکی لەو ڕاپۆرتەیدا کە بۆ بالیۆزی ڕووسیای نارد لە ئەستامبوولْ . ئەوەی دەستنیشان کرد کە خەڵکی لەتاو برسێتی ناچاربوون گۆشتی کەر یان گژو گیاو ڕەگی ڕەوەك بخۆن[22] .

کاربەدەستانی ناوچەی دیاربەکر . سڵیان لەوە ئەکردەوە ڕاپەڕینە بچووکەکانی ئەم شوێنو ئەو شوێن یەك بگرنو ببنە ڕاپەڕینێکی گشتی . لەوەش ئەترسان پەلاماری عەماری گەنمو جۆو ماڵی باج گرەکانو قاجاخچییەکان بدرێت . لەبەر ئەمە هاتن یاساوڵی تایبەتییان بۆ ئەو ماڵانە داناو دەروازەکانی شوورەی شارەکەشیان بە سەرباز تەنی . نیاز لەمە ئەوەبوو ڕێگا

نەدرێت کوردە برسییەکان بێنە شارەوە ، ئەوانەی لە هەموو لایەکەوە بەلێشاو روویان تێ‌ئەکرد .

برسێتی‌و بێ دەرامەتی کاریان‌کردە سەر کۆچەرو نیمچە کۆچەرەکانیش گەلێك لە کوردە خاوەن مەڕو مالاتەکان ، ئەوانەی لە بەخێوکردنی مەڕومالات کەوتبوون ، ناچاربوون شاخەکانیان بەجێ بهێلن‌و رووبکەنە شارەکان ، یان هەولبدەن کارێکی وەرزی بدۆزنەوە ، واتە لای ئەم یان ئەو دەرەبەگ بینە شوان‌و خۆیانی پێ بژێنن .

هەزارەها کورد ، ئەوانەی بەهۆی گەرە لاوژەو پاشاگەردانی‌و برسێتییەوە کەوتبوونە دۆخێکی تەواو قورسەوە ، وازیان لە هەموو شتێکیان هێناو روویان‌کردە کۆنسۆلخانەی رووسیا بەو نیازەی دەستی یارمەتییان بۆ درێژبکرێت . لە مایسی سالی ١٨٨٠ دا سەرۆکی گیانی (پەتریارك) ئاسووریەکان لە میدیاتەوە پەنای بردەبەر ماکیانسکی یاریدەدەری کۆنسۆلی رووسیا لە دیاربەکرو داوای لی‌کرد رێگا بدرێت بە دە هەزار کوردی موسولمان بچنە ژێر سایەی رووسیاوە ، یان رێگایان پێ بدرێت سنوور ببرن‌و بچنە ناو وولاتی رووسیاوە .

گەلێك روویان‌کردە باکوور ، واتە بەرەو سنوورەکانی رووسیا . ئامانجیان ئەوەبوو پارچە نانێك دەست‌بخەن . رووداو دیوەکان نووسیویانە کە هەمووڕێگاو بانەکانی شاخی ئارارات بە کوردی رووت‌و برسی تەنرا بوون . گەلێك لەوانە لەتاو لاوازی‌و بێ‌هێزی مردن[٢٤] .

ئەم دۆخی ژیانە قورسەی دانیشتووەکانی باکووری رۆژهەلاتی ناوچەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی هەستی ئەرمەنەکانی بزواند . گەلێك لە ئەرمەنەکانی رووسیا بەدەنگیانەوە چوون‌و پارەو کەل‌و پەل یارمەتی برسییەکانی تورکیایان‌دا . بەشێك لەم یارمەتیانە بۆ کوردەکان تەرخان کرا . بە واتەی رۆژنامەی (مشاك) ، ئەرمەنەکان لە ٢٥٪ ی یارمەتییەکەیان لە چوارچێوەی پارەو کەل‌و پەلدا دا بە کوردەکان[٢٥] .

(نووسەر باسی ئەوە ناکات جگە لە کوردەکان میللەتێکی تریش هەبێ خێر پێ‌کردن‌و یارمەتی‌دان بهێنێ – وەرگێر) .

لە سالی ١٨٧٧ دا ، برسێتی بە شێوەیەکی قورس ناوچەکانی کوردستانی ئێرانیشی گرتەوە . بۆنموونە : خوی ، ساوجبلاق ، ورمێ ، سنەو شوێنی تر . لەم ناوچانە خەلکێکی زۆری هەلاتوو لەتورکیاوە لەتاو برسێتی بەدی ئەکران ، ئامانجیان ئەوەبوو دەرفەتێکیان دەست‌بکەوێت . لەم ماوەیەدا لەسەر سنوورەکانی ئێراندا لە سنوورێکی فراواندا بازرگانی بە مندالان ئەکرا . بەپێی چەند هەوالێك شاری دیلمان بنکەی بازرگانی کردن بوو بە مندالانی کورد . لەوێ «کورد مندالانی خۆیان زۆر بە هەرزان ئەفرۆشت – ئەمەش ببووبووە عادەت – .»[٢٦]

لەمەش زیاتر ، بەواتەی (ئەبۆتا)ی ، کۆنسۆلی گشتی ئینگلیزی لە تەبریز ، هەموو دانیشتووانی گوندێکی کورد لە ئێران مردن ، لە چەند گوندێکی تریشدا تەنیا ژنان‌و منالان مابوونەوە .»[٢٧] .

مووچەخۆرە دەولەمەندو خاوەن زەوی‌و زارە ئێرانییەکان ، کوردە برسییەکانیان بەسەرچاوەی هەرەشەو مەترسی دائەنا . هەرگیز هەرەشەیان ئەکرد عەماری گەنم‌و جۆکانیان تالان بکەن ، بیریان لەوە نە ئەکردەوە ئەو عەمارانە پارێزگاری ئەکرێن‌و بە ئاسانی نادرێن بەدەستەوە . «برسێتی لەو ناوچانە – رۆژنامەی مشاك ئەنووسێت – خەلکەکەی گەیاندۆتە رادەی هاربوون ، لەوەدا نەماون گوێ‌بدەنە یاساو سل لە گوللەی یاساولەکان بکەنەوە ، بەهێرشەوە پەلاماری عەماری گەنم‌و جۆ ئەدەن‌و تالانیان ئەکەن» .

بەلام زۆری نەبرد کوردەکان وازیان لەو جۆری خەباتە عەفوییە ، واتە پەلاماردانی عەماری گەنم‌و جۆ هێناو هاتنە سەر ئەوەی خۆیان لە راپەرینێکی چەکداری رێکخراودا کۆبکەنەوە ، ئەو راپەرینەی لە سالی ١٨٨٠ دا تەقییەوەو بووە راپەرینێکی فراوانی میللی .

# ووشە

وریا عمرامین

نەبوونی (مطلق) هەوێنی پەرەسەندنی زانستو بیرە . هەچ پێناسینێك بۆ هەچ دیاردەیێك لە هەچ لقێکی بیرو زانستا بە دەستەوە بگرین . . گەر بە قووڵی شیی بکەینەوەو لیی وردبینەوە کەلەبەرو کەموکوڕیی تیا هەر ئەدۆزینەوە . بە پیی ئەم کەلەبەرو کەموکوڕیانە پێناسینێکی تازەی بۆ دائەرێژرێ . ئەم پێناسینو بۆچوونە تازەیەش هەمان شت گەر زیاتر لیی ووردبینەوە دیسان دەرئەکەوێ کە پڕ بە پێست نییەو بەم جۆرە .

هەر قوتابخانەیێکی تازە لە هەر بوارێکدا بێ هەوڵدانە بۆ پڕکردنەوەی کەلەبەرو کەموکوڕیەکانی ئەوانی پێشووی .

زانستی زمان لەم رووەدا بوارێکی پڕ کێشەیە . ئەم ووتارە هەوڵدانە بۆ دەرخستنی هەندێ کەموکوڕیو کەلەبەری پێناسینی ووشەو مۆرفیمو دابەشکردنی زمانەکانی جیهان بەپیی پەیوەندیی نێوان مۆرفیمەکان لەناو قاڵبی ووشەدا .

## ووشە

ڕێزمانی تەقلیدی ووشەی بۆ شیکردنەوەی زمان بە بنج داناوە ، بەڵام نەیتوانیووە پێناسینێکی ڕێك بۆ ووشە دارێژێ بشێ نەزەرییەیەکی گشتیی لەسەر دابنرێو بکرێ بە پێوانە بۆ شیکردنەوەی زمان . (رستە لە کۆمەڵە ووشەیەك پێك دێت . .) . (بەشەکانی ئاخاوتن بریتین لە چەن کۆمەڵە ووشەیێك) . . بەڵام ووشە خۆی چییەو چۆن لە زمانا دەستنیشان ئەکرێ . . ئەوەیان ساغ نەکراوەتەوە .

ئەو پێناسینو پەیرەوانەی بۆ چەمکی ووشە دانراون ئەنجامێکی ئەوتۆ بە دەستەوە نادەن . گەلێ ناوێزەو کەلەبەریان تیا دەرئەکەوێ . . یا تەنیا بۆ چەن زمانێ ئەشێن (ئەویش بە

تەواوی نا) .

١ – ووشە بریتی‌یە لە کۆمەڵە دەنگێکی بەزار دروست کراو مانایێك ئەبەخشێ . .

بە خوێندنەوەو نووسینەوە پیاو ئەتوانێ هەزاران ووشە بخاتە ناومێشك‌و لی‌یەوە دەربهێنێ بێ ئەوەی زاری بکاتەوەو نقەی لێوەبێ . ئەمە ئەوە دەرئەخا کە مەرج نی‌یە ووشە بریتی بێ لەدەنگ . .

گریان‌و پێکەنین کۆمەڵە دەنگن بەزار دروست ئەکرێن‌و ماناش ئەبەخشن (ئازار ، خەم ، شادی ، گاڵتە . . . هتد) چۆن بە ووشە لەقەڵەم ئەدرێن ؟ .

بابڵێین (گوڵ) ، (گەنم) ، (رەش) ، (با) ، (دەست) (کورت) . . . هتد هەر یەکە ووشەیەکەو بە کۆمەڵە دەنگێکی زار دروست ئەکرێ‌و مانایێك ئەبەخشێ (گوڵەگەنم) ، رەشەبا)و (دەست‌کورت) هەر یەکە چەن ووشەن‌و چەن مانا ئەبەخشن ؟ .

(گوڵ) ، (گوڵەکە) ، (گوڵەکان) ، (گوڵەکانم) هەر یەکە ووشەیەکە . . ئایا لەرووی ماناوەش هەر یەکە مانایێك ئەبەخشێ ؟ . چ پێوانەیێك وامان لێ ئەکات بڵێین (گوڵ)و (بمانخواردنایە) هەر دووك بەر چەمکی ووشە ئەکەون لەکاتێکا (گوڵ) تاکە مانایەك ئەبەخشێ‌و (بمانخواردنایە) مانای رستەیەکی بە بکەرو بەرکارو فرمان‌و لە رووی کاتەوە ئاڵۆز ئەبەخشێ . لێرە چۆن سنووری نێوان ووشەو رستە دەست نیشان ئەکرێت ؟

لە (گوڵ‌و موڵ)و (نەزان و مەزان)دا ، (مۆل مەزان) ووشەن یا نا ؟ . گەر ووشە بن چ مانایێکیان لە فەرهەنگا بۆ دائەنێیت ؟ گەر ووشە نەبن چین ؟ دەنگن‌و بەزار دروست ئەکرێن‌و لەزمانا بەکار ئەهێنرێن

(بار) کە زیاتر لە مانایێك ئەبەخشێ وەك لە (بارەدارێك)و (بارێکی نالەبار) بە یەك یا دوو ووشە ئەژمێررێن ؟ . .

گەلێ پرسیاری تری لەم بابەتە ئەشێ ئاراستە بکرێن بێ ئەوەی وەلامێکی لەسەر مەنتیق دامەزراویان بۆ بدۆزرێتەوە . جگە لەمانە هەموو چەمکی (مانا) خۆی شتێکی شاراوەیە . (مانای مانا) خۆی ساغ نەکراوەتەوە ، ئیتر چۆن ئەشێ شتێ بکرێ بە پێوانە بۆ پێناسینێ شتێکی تر کە ئەو شتە خۆی شاراوە بێ‌و ساغ نەکرابێتەوە .

هەچ هەوڵدانێك بۆ پێناسینی ووشە بەپێ‌ی مانا هیچ ئەنجامێ بەدەستەوە نادات .

٢ – ووشە هەر دانەیێکی سەر بەخۆیە لەزمانا بتوانی (لەهەندێ بیئەدا) دەوری رستەیێکی تەواو بگێریت . (من) ووشەیێکە چونکە لەو وەلام دانەوەی (کێ خواردی ؟) ئەڵێن (من) . ئەم (من)ە دەوری رستەیەکی تەواوی گێڕاوەو کورت کراوەی رستەی (من خواردم)ە .

ئەمە گوایا لەگەڵ پاشگرو پێشگری وەك (–ەوە ، –ن ، –دا ، دا – ، هەڵ – ، وەر – . . . . هتد) ناکرێ . بۆیە ئەمانە بە ووشە لەقەڵەم نادرێن .

ئەمەش ناشێ بکرێ بە پێوانە بۆ پێناسینی ووشە لەبەر ئەم هۆیانە :

أ – ئەشێ پرسیاری وا داربێژرێ وەلامەکەی پاشگر یا پێشگر بێ وەك لە (دوا پاشگری ووشەی **کردنەوە** چی‌یە ؟) لە وەلاما ئەڵێ (**ەوە**) . . یا بینووسەو بپرسە چی لێرە نووسراوە ؟

ب – دەیەها ووشەو پریپۆزیشنی وەك (بەلام) چونکە ، کەی ، بۆ ، تا ، لەگەڵ . . هتد) ناشی بکرێن بە وەلامی پرسیار .

٣ – لە هەندێ زمانا بەپێوانەی فۆنۆلۆجی ووشە دەست نیشان ئەکرێت . بۆنموونە زمان هەیە لە ووشەکانیا هێز Stress ئەکەوێتە سەر دوا بڕگەی ووشەوە . واتا شوێنی هێز ئەبێ بە سنووری ووشە وەك لەزمانی کوردیدا . ئەمەش هەموو ووشەیێك ناگرێتەوەو گەلێ ناوێزەی تیا دەرئەکەوێ وەك (بەلام

- چونکه -.. هتد)

زمانی تورکی‌و هەنگاری لە لێقلی فۆنۆلوجیدا سەر بە سیستەمی (ڤاولْ هارمۆنی)ن Vowel Harmony . لەم جۆرە زمانانەدا ڤاوڵی رەگ چ جۆر بێ ڤاوڵی پێشگرو پاشگریش سەر بۆ هەمان جۆر دائەنوێنن.. واتا گۆڕینی شێوەی ڤاولْ گوێزانەوەیە لە ووشەیەکەوە بۆ ووشەیێکی تر. لەم جۆرە زمانانەش سەدەها ناوێزە دەست‌نیشان ئەکرێ‌و ئەم پەیرەوە ناشێ بکرێ بەپێوانە بۆ پێناسین‌و دەست‌نیشان کردنی ووشە تەنانەت لەم زمانانەشدا.

ئەوەی ووترا ئەوە ئەسەلمێنی کە هیچ پێوانەیێکی سیمانتیکی یا فۆنۆلۆجی نی‌یە بۆ پێناسینی ووشە لە زمانا بشێ بکرێ بەبنج بۆ شی کردنەوەی زمان بۆیە زانایانی زمان روویان لە ووشە وەرگێڕاو لە جێگیری (بدیل)تر گەڕان. یەکێ لەم جێگیرانە چەمکی (مۆرفیم) بوو.

**مۆرفیم**

مۆرفیم بچووکترین دانەی واتاداری زمانە لە فۆنیمێ یا زیاتر پێك دێت‌و دەورێکی لە رێزمانا هەیە. بە گۆڕین‌و لابردنی هەر فۆنیمێکێ یا بە لەت لەت کردنی ماناو دەورە ئەسڵی‌یەکەی تیا ئەچێ. واتا مۆرفیم سێ رووی هەیە.

١ - قاڵبێکی فیزیاوی - فۆنیمەکانی

٢ - مانایێك

٣ - دەورێك لە رێزمانا.

بۆنموونە ووشەی (مانگ) لە زمانی کوردی‌یا یەك مۆرفیمە چونکە:

- قاڵبێکی فیزیاوی‌ی هەیە کە فۆنیمەکانی‌یەتی (م-ا-ن-گ) ئەوەیەکە لە قسەکردنا بەدەنگ ئەبیسترێن.

ب - مانایەکی هەیە (ئەو کەرەسە ئاسمانی‌یەیە کە... هتد)

ج - ئەتوانێ دەور لەرێزمانی کوردی‌یا ببینێ. بۆ نموونە ئەتوانێ لە لێقلی سینتاکسیدا وەك (بکەر) یا (بەرکار)ی رستە دەرکەوێ

**مانگ هەڵات**

**من مانگ ئەبینم**

بەلابردنی هەچ فۆنیمێکی یا بە لەت‌لەت کردنی. قاڵب‌و مانا ئەسڵی‌یەکەی تیائەچێ. (م- انگ). (ما-نگ) (مان - گ). (م -ان - گ).. هیچ ماناو دەورێکیان لە زمانی کوردی‌یا بۆ نادۆزێتەوە پەیوەندی‌ی بە ماناو دەورە ئەسڵی‌یەکەیەوە هەبێ. بۆیە مانگ یەك دانەی ساغە لەم زمانەداو یەك مۆرفیمە.

پەیا بوونی مانا بۆ هەندێ لە لەتەکانی مۆرفیم پەیوەندی‌ی بە مانا ئەسڵی‌یەکەیەوە نابێ‌و مەسەلە رێکەوتە. بۆ نموونە لە ئەنجامی ئەو لەت‌لەت کردنانەی مۆرفیمی (مانگ) وەك لەسەرەوە پێشکەش کرا ئەم دوو لەتە **(مان - ان)** ماناو دەوریان لە رێزمانی کوردی‌یا هەیە (مان - چاووگە)و (ان - ئامرازی کۆیە).

دیارە کەم ئەم دوو دانەیە هیچ پەیوەندی یەکیان بە مانای (مانگ)ەوە نی‌یە.

مۆرفیمیش وەك ووشە سەری نەگرت‌و نەشیا ببێ بە پێوانە بۆشی کردنەوەی زمان لەبەر ئەم هۆیانە:

١ - ئەو زمانانەی بە تواوە Fusional ناو ئەبرێن مۆرفیمەکان لە ناو قاڵبی ووشەکانیانا لەناو یەکا ئەتوێنەوەو دەست‌نیشان ناکرێن. بۆ نموونە لە زمانی عەرەبی‌یا (-ون) مۆرفیمی کۆیە لەگەڵ هەندێ ناو دەرئەکەوێ (معلم - معلمون. قادر - قادرون... هتد) بەڵام سەدەها ووشەی تیایە مۆرفیمی کۆیان هەرگیز تیا دەست نیشان ناکرێت (طالب - طلاب. عالم - علماء. امه - امم. علم - اعلام...هتد). چۆن لەم ووشانەدا مۆرفیمەکان دەست‌نیشان ئەکرێن‌و چۆن ئەم زمانە بە پێ‌ی مۆرفیم شی‌ئەکرێتەوە.

٢ - تەنانەت لەو زمانانەشدا کە مۆرفیمەکانی ووشەکانیان بە

ئاسانی دەست‌نیشان ئەکرێن حاڵەتی وا دێتە ئاراوە پێناسین‌و چەمکی مۆرفیان لەگەڵا نەگونجێ. بۆ نموونە لە زمانی کوردی‌یا ، کە راناوی هەبی‌ی کەسی سێ‌یەمی **تاکی (ی) و** فرمانی کاری بوونی کەسی سێ‌یەمی تاکی کاتی ئیستا **(ـە)** پێکەوە دەرئەکەون **(ق)** پەیا ئەبێ :

**تاك**

**کەس**

**١ برا – م – ە**

**٢ برا – ت – ە**

**٣ برا – ی – ە (ق)**

**کۆ**

**١ برا – مان – ە**

**٢ برا – تان – ە**

**٣ برا – یان – ە**

ئەم (ق)یە قاڵبێکی فیزیاوی‌ی هەیەو لە لێقڵی فۆنۆلۆجیدا ئەشێ دەورێکی پێ بسپێرێ . . بەڵام مانای چی‌یە ؟ .

ئیستا سەیری ئەم نموونانە بکە . .

**من چوو – م**

**تۆ چوو یت**

**ئەو چوو ە**

**ئێمە چوو – ین**

**ئێوە چوو – ن**

**ئەوان چوو – ن**

لە کەسی سێ‌یەمی تاکدا . . ماناو دەور هەیە بەڵام قاڵب نی‌یە .

زانایانی زمان بۆ چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتانە لە دابەش کردن‌و[1] دەست‌نیشان کردنی جۆری مۆرفیمەکان بابەتی **(ق)یانە** خستۆتە خانەی مۆرفیمی بۆش empty morphemeو ئەوەی ماناو دەوری هەبێ‌و قاڵبی فیزیاوی نەبێ خستوویانەتە خانەی مۆرفیمی صفر Zero morpheme . . . هەر خۆشیان ئەڵێن . . ئەمە هەر پۆشینە .

زمانەوانی سەدەی نۆزدەم ئۆگۆست شلایشەر زمانەکانی جیهانی دابەش‌کردە سەر سێ جۆر بە پێ‌ی پەیوەندی‌ی نێوان مۆرفیمەکان لەناو قاڵبی ووشەدا .

١ – ئەو زمانانەی ووشەکانی بریتین لە ریزە مۆرفیمێك و مۆرفیمەکان بە ئاسانی دەست‌نیشان ئەمرێن‌و لێك جیائەکرێنەوە ناوی نان agglutinative واتا **(نووساو)** (مۆرفیمەکان بەریز بە یەکەوە ئەنووسێن) وەك زمانی کوردی ، تورکی ، یابانی ، سواهیلی . . هتد .

٢ – ئەو زمانانەی کە مۆرفیەکانی لە ناو یەکا ئەتوێنەوە و بەئاسانی دەست‌نیشان ناکرێن‌و لێك جیا ناکرێنەوە ناوی نان fasional واتا **(تواوە)** .وەك زمانی عەرەبی ، لاتینی ، گریکی . . هتد

٣ – ئەو زمانانەی کە هەر ووشەیێکی لە تاکە مۆرفیمێك پێك هاتووە ناوی نان Isolating واتا (دووره‌پەرێز) . لەم جۆرە زمانەدا هەر دانەیەکی ماناو هەر دانەیەکی رێزمانی بە مۆرفیمێکی سەربەخۆ دەرئەبرێ . وەك زمانی چینی .

دوایێ ساغ بووەوە کە هیچ زمانێك لە جیهانا نی‌یە بە تەواوی بەر یەکێ لەم سێ‌جۆرە بکەوێ . لەهەموو زمانێکا هەر سێ قاڵب بۆ دارشتنی ووشە دەست‌نیشان ئەکرێن ، ئەوەندەیە جۆرێکیان بەسەر دووەکەی تر زاڵ ئەبێ‌و زمانەکە بەمەوە ناو ئەبرێ . بۆ نموونە زمانی کوردی زمانێکی نووساوە چونکە مۆرفیمەکانی ووشەکانی بە ئاسانی دەست نیشان ئەکرێن‌و لێك جیا ئەکرێنەوە .

**کوڕەکانت ← کوڕ – ەکە – ان – ت**

**بمانوسینایە ← ب – مان – نووسی – ن – ایە**

**نموونەی دوو جۆرەکەی تریشێ تیا بە رێژەیێکی کەم دەرئەکەوێ .**

نموونەی دوو جۆرەکەی تریشی تیا بە رێژەیێکی کەم دەرئەکەوی .

لە زمانی کوردی‌یا هەموو ڕەگێکی فرمانی ڕابردوو بە **(ی)** کۆتایی هاتبێ ئەم (ی)یە مۆرفیمی کاتی ڕابردووە .

| کاتی ڕابردوو | کاتی داهاتوو |
|---|---|
| **نووسی** | **نووس** |
| **پرسی** | **پرس** |
| **دزی** | **دز** |
| **ناسی** | **ناس** |

هتد

هەموو فرمانێکی ڕابردووی تێپەڕ بە (أ) کۆتایی هاتبێ ئەم (أ) مۆرفیمی کاتی ڕابردووە[٢] .

| کاتی ڕابردوو | کاتی داهاتوو |
|---|---|
| **کێلا** | **کێل** |
| **کێشا** | **کێش** |
| **هێنا** | **هێن** |
| **گێڕا** | **گێڕ** |

هتد

لە هەندێ فرمانا مۆرفیمی کاتی ڕابردوو لەناو ڕەگی کاتی ئیستا تواوەتەوەو دەست‌نیشان ناکرێو جیاناکرێتەوە .

**کوشت ←—— کوژ + مۆرفیمی کاتی ڕابردوو**

**هات ←—— ێ + مۆرفیمی‌کاتی ڕابردوو**

**هێشت ←—— هێڵ + مۆرفیمی کاتی ڕابردوو .**

**هتد :**

ئەمانە نموونەی **(تواوە)ن** لە زمانی کوردی‌یا .

نموونەی (دوورەپەرێز)یش Isolating ئەو ووشە یەك مۆرفیمی‌یانەن کە هیچ پاشگرو پێشگر وەرناگرنو ناچنە سەر هیچ . وەك (چونکە ، بەڵام ، تا ، بۆ؟ ، کەی . . . هتد) .

ژمارەی ئەم دوو جۆرەی دوایی زۆر کەمن بەجۆرەی جۆری یەکەم ، بۆیە زمانی کوردی بە نووساو agglutinative لەقەڵەم ئەدرێ .

## پەراوێزەکان

(١) – مۆرفیم لە چەن ڕووەکەوە دابەش ئەکرێ

١ – مۆرفیم (سەربەست)ە یا (بەند) . مۆرفیمی سەربەست ئەوەیە کە بە تەنیا وەك دانەیێکی سەربەخۆ دەرئەکەوێو ووشەیێکی سەربەخۆ پێك ئەهێنێ وەك (کچ ، چیا ، منالّ . . هتد) . مۆرفیمی (بەند)یش ئەوەیە کە هەرگیز وەك دانەیێکی سەربەخۆ دەرناکەوێو ئەبێ لەگەڵ مۆرفیمێکی‌تر دەرکەوێ وەك (–ەکە ، هەڵ – ، نە– ، – ان . . . هتد) .

٢ – مۆرفیم (ڕەگ)ە یا (لکاو) affix ڕەگ ئەو بەشەی ووشەیە کە دوای لابردنی هەموو ئەفیکسەکان (پاشگر ، پێشگر ، ناوگر) ئەمینێتەوە . جیا کردنەوەی ئەم دوو جۆرە مۆرفیمە کارێکی ئاڵۆزە . بە شێوەیەکی گشتی ئەشێ بووترێ کە ڕەگ (ناووك)ی ووشە پێك ئەهێنێو لە ئەفێکس درێژترنو بە ژمارە زۆرترن لەهەر زمانێکا . ژمارەی ئەفێکسەکان (داخراوە) واتا ڕێگا ناداتە هی تر بچێتە ناویانەوە . گۆڕینی ژمارەیان بەندە بە گۆڕینی سیستەمی (ڕێزمانی)ی زمانەکەوە .

بۆ نموونە ڕاناوەکانی هەیی (تملك) لە زمانی کوردیدا ئەم شەشەن (م–ت–ی–مان– تان – یان) کۆمەڵێکی داخراوە ڕێگە نادەن بەهی تر بچێتە ناویانەوە . هەر ئەمانەن لای هەموو قسەکەرێکی ئەم شێوەیە . کەچی مۆرفیمی ڕەگ سنوور بۆ ژمارەی نی‌یەو دەرگای بۆ کراوەتەوە هەمیشە هی تازەی بێتە ناو . ژمارەی هەمیشە لەگۆڕیندایە بە نەمانو پەیانی یوونی هی‌تازەو لە قسەکەرێکەوە بۆ قسەکەرێ .

ئەفێکس سێ جۆرە (پێشگر ، پاشگر ، ناوگر) پێشگر ئەو ئەفێکسەیە کە لەپێش ڕەگەوە دەرئەکەوێ وەك (هەڵ – هەڵگرتن ، ڕا – ڕاکردن ، ئە – ئەخۆم . . . هتد)

پاشگر ئەو ئەفێسکەیە کە لە دوای ڕەگەوە دەرئەکەوێ وەك (ەکە – کوڕەکە ، ەوە – خواردنەوە ، ن – کێلان . . هتد) .

هەندێ دانەی ڕێزمانی هەن لەهەندێ زمانا هەم پاشگرن هەم پێشگر . وەك کۆمەڵە ڕاناوی (م – ی – ت – مان – تان

– یان)

| وەك پاشگر | وەك پێشگر |
|---|---|
| خوارد – **م** | ئە –**م**– خوارد |
| خوارد – **ت** | ئە – **ت** – خوارد |
| خوارد –**ی** | ئە – **ی** – خوارد |
| خوارد –**مان** | ئە – **مان** – خوارد |
| خوارد –**تان** | ئە –**تان** – خوارد |
| خوارد – **یان** | ئە – **یان** – خوارد |

ناوگریش ئەو ئەفێکسەیە کە لەناو ڕەگدا دەرئەکەوێ (بەپێی) زانیاریی من ئەم جۆرە ئەفێکسە لەزمانی کوردیدا نیە . ئەو نموونانەی هەندێ نووسەر ئەیهێنن کە گوایا ناوگرن ناشێ بەناوگریان لەقەڵەم بدەین چونکە بەر پێناسینی ناوگر ناکەون . پێوانە بۆ ناوگر ئەمانەن .

١ – ڕەگ بسمێ (واتا بچێتە ناو ڕەگەوە)

٢ – بەرهەمدار (منتج) بێ بچێتە سەر ژمارەیێکی زۆر ڕەگو هەمان دەور بگێڕێ نەك تاقە ووشەیێك . واتا وەك یاسا ئەبێ گشتی بێ دەرکەوتنی ئەم دەنگانە لەو نموونانەی بە ناوگری لەقەڵەم ئەدەن هۆی فۆنۆلوجییان هەیە نەك مۆرفۆلوجی یا سینتاکسی .

٣ – مۆرفیم مۆرفۆلوجی (اشتقاق) یە یاسینتاکسی (ڕێزمانی)یە .

مۆرفیمی مۆرفۆلۆجی ئەوەیە کە ئەچێتە سەر مۆرفیمی تر بۆ دروست کردنی ووشەی تازەی خاوەن مانای تازە وەك (هەڵ – ڕا – دا – وەوە – تێ . . . هتد) لەگرتن – هەڵگرتن ، کردن – ڕاکردن ، مان – دامان ، کردن – کردنەوە) .

مۆرفیمی (ڕێزمانی)ش ئەوەیە کە ئەچێتە سەر ووشە بۆ دەربڕینی پەیوەندیی نێوان ووشەکان لە ناو چوارچێوەی ڕستەدا . بۆ نموونە ئەو ڕاناوە لکاوانەی لەگەڵ فرمانا دەرئەکەون لەزمانی کوردیدا هەموو مۆرفیمی ڕێزمانین چونکە پەیوەندیی نێوان بکەر و فرمان دەستنیشان ئەکەن .

**من نوست – م**

**ئێمە نوست – ین**

لە ڕستەی (کچە جوانە زیرەکەکە هات) (ە)ی (کچە)و (جوانە) مۆرفیمێکی ڕێزمانیە دەوری لەیەکدانی (ناو)و (ئاوەلناو)ی لەم ڕستەیەدا بینی ، کە دەورێکی ڕێزمانیە .

مۆرفیم لە ئەنجامی کار تێکردنی ئەو بیئە جیاوازانەی تیایا دەرئەکەون شێوەی جیاواز ئەگرنە خۆ . بۆ نموونە مۆرفیمی (ەکە) –کە ئامرازی پێناسینە لەزمانی کوردییا خۆی بەم قاڵبانە پێشان ئەدا

| | | |
|---|---|---|
| **ەکە** | کوڕ – **ەکە** | کوڕەکە |
| **کە** | مامۆستا –**کە** | مامۆستاکە |
| **ەك** | کوڕ –**ەك** – ان | کوڕەکان |
| **ك** | مامۆستا –**ك**– ان | مامۆستاکان |

(**ەکە** – **کە** – **ەك** – **ك**) هەموو شێوەی جیاوازی هەمان مۆرفیمن . . بیئەی جیاواز ئەم شێوە جیاوازانەی دانێ . هەر شێوەیەك (مۆرف)ێکە شێوەکان (ئەلەمۆرف)ی یەکترنو سەر بە هەمان مۆرفیمن .




**مۆرفیم و ووشە**

ووشە لەزمانی کوردییا لە مۆرفیمێ یا زیاتر پێك دێت

(کەم ووشەی تیا لە پێنج مورفیم زیاترە) .
١ - ووشەی یەك مۆرفیمی (دڵ - گەلاوێژ - ئارەزوو)
٢ - ووشەی دوو مۆرفیمی (باڵ - دار ، ئازاد -ی)
٣ - ووشەی سێ مۆرفیمی (ئە - خۆ - م . نا - چ - ین)
٤ - ووشەی چوار مورفیمی (ئە - ی - ناس - م . زام - ەکە - ان - م)
٥ - ووشەی پێنج مۆرفیمی (هەڵ - ی - ئە - گر - م . را - یان - ئە - سپێر - م) .

**مۆرفیمو برگە**

مۆرفیمو برگە دوو شتی جیان . مۆرفیم سەر بە لایەنی (مانادار - سیمانتیك)ی زمانە . برگە قاڵب دارشتنەو سەر بەلایەنی بێ‌مانای زمانە (فۆنۆلۆجی) . لەناو قاڵبی برگەکاندا فۆنیمەکان لەیەك ئەدرێن بۆ دروست کردنی مۆرفیمەکان . پەیوەندیی برگە و مۆرفیم لە زمانی کوردی‌یا بەم جۆرەیە .

١ - دوو مۆرفیم لە برگەیەکدا (خۆ - ت . لا-م)
٢ - یەك مۆرفیم لە برگەیەکدا (مانگ - سەوز)
٣ - یەك مۆرفیم لە دوو برگەدا (بەهار - ئاسۆ)
٤ - یەك مۆرفیم لە سێ برگەدا (گەلاوێژ - ئارەزوو - ئەستێرە)

(٢) - دان بەر ئەم یاسایە ناکەوێ . سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە - (کاتورەگی فرمان) گۆڤاری رۆژی کوردستان ژ ٦٥ شوباتی ١٩٨٤ .

### سەرچاوەکان


١ - و . ع . امین (١٩٨٢) «ووشە» - گۆڤاری نووسەری کورد ژ ٩ خولی دووەم .
٢ - و . ع . امین (١٩٨٤) «مۆرفیم» - رۆژنامە العراق ژ ٢٤٩٣ (١١-٤-١٩٨٤)
٣ - رێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کۆڕی زانیاری‌ی کورد

٤ - Lyons, J. (1971) (Introduction to theoretical Linguistics) Cambridge.
٥ Fromkin, v. and Rodman , R . (1978)
٦ - (An Introduction to language) New York


# جێناوی پرسیار لە زمـ...

لە گەرانو پشکنین بە دیالێکتو بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا چەند دەستەیەك جێناوی پرسیار دێتە پێش چاو :

١ - **کێ / کی .**
٢ - **چی / چ / چە .**
٣ - **کام / کامە / کێهە / کێها / کێهان / کێژان .**
٤ - **چۆن / چلۆن / کوو /چەوان(ن)/ چاوا (ن) .**
٥ - **کەی/ کەنگێ/کەنگی/ کەنگین/کەنگینێ/ کەینێ .**
٦ - **کوا / کوانێ / کا / کانێ .**
٧ - **کوێ / کوێندەرێ / کیرێ / کیدەرێ / کوێدەرێ / کوو .**
٨ - **چەند / چەن / چەنگ .**

**کێ / کی**

ئەم جێناوە بۆ پرسیاری ئەو کەسە بەکاردەبرێ ، کە

•

د . ئەورەحمان حاجی مارف

•

# ...انی کوردیدا

کارێکی کردبێ یان بیکا .

وێکچوون و نزیکیی ئەم جێناوە لەو زمانە کۆن و نوێیانەی لەگەڵ کوردیدا خزمایەتی‌یان هەیە ، دەبینرێ . بە وێنە لە ئاوێستادا «کە»[1] ، لە فارسی کۆن و هیندیی کۆندا «کەیە»[2] ، لە فارسیی ناوەڕاستدا «کی»[3] ، لە فارسیی نوێدا «کە»[4] ، لە بلووجیدا «کێ/کە»[5] . . . یە .

لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا (چ لە زمانی ئەدەبی و چ لە بەشە دیالێکتەکانی موکریان و سۆراندا) چۆن لە زوودا تەنیا فۆرمی (کێ) بەکاردەهێنرا ، ئەمڕۆش بەهەمان چەشن هەر فۆرمی (کێ) بەکاردهێنرێ . لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ئەگەرچی هەردوو شێوەی (کێ)یش و (کی)یش هەیە ، بەڵام (کی) زۆرتر بەکاردێنرێ . هەرچی (کێ)یە پتر لە دۆخی تیاندا دەبینرێ . .

• لە دیالێکتی خوارووودا

کێ دەستی دەگاتە بەیو ناری نەگەیشتوون
لەو تەختە کەوا صاحیبی مۆرن بە صەدارەت ؟

(نالی ، ل ١٤٦)

کێ کردی ، کێ بردی ؟

(پەندیپێشینان ، ل ٣٥٦)

کێ وا لەژێر زنجیرا
ئازادیی هات بەبیرا ؟

(گۆران ، ل ٨٥)

میر زێندین ناردیە کن قەرەتاژدینی : «کێ مواجبی لێبڕیوە ؟ کێ قسەی پێ‌گوتوە ؟ . . .

(تحفة مظفریه ، ب ١ ، ل ٢٨٥)

ئەو کانی‌یەکەی لە سێبەرێ
بەخۆم لێدا بە خەنجەرێ
کێ ئاو لێبرد زەرد ئەسمەرێ

(فۆلکلۆر ، ل ٦٢)

• لە دیالێکتی ژووروودا :

کی دبێژە دۆیێ من ترشە ؟

(کوردۆ ، ل ٢٤٣)

ئەڤ ڕەنگێ کێ دی وە ب سوڕ
قودرەت نموون زەنگارێ (خط)

(جزیری ، ل ٢٤٨)

کی دەردێ کێ دزانە ، هەر کەی دەردێ خوە دزانە

(کوردۆ ، ل ٢٤٣)

## چی / چ / چە

ئەم جێناوە بۆ پرسیار لە شت و هۆی ڕووداو بەکاردێنرێ .

له ناوچەی سلێمانی بە زۆری شێوەی (چی) دەوترێ‌و کەمێ جاریش (چ) . له ناوچەی خانەقین‌و سنەو کرماشان . . . (چە) دەڵێن . له بەشە دیالێکتی موکریان[٦] و سۆران‌و دیالێکتی کرمانجی ژووروودا[٧] (چ) باوە ، بەڵام له دۆخی تیاندا هەمیشە دەبێ به (چی) .

ئەم جێناوە له ئاوێستادا له شێوەی «چەهیە»[٨] ، له فارسی ناوەڕاستدا «چیێ»[٩] ، له فارسی نوێدا «چ»[١٠] ، له بلووجیدا «چ ، چیێ»[١١] . . . دەبینرێ .

نموونە :

گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم ؟ !
بۆچی به ناهەق وا سووکت کردم ؟ !
(بێکەس ، ل ٧٥)

چی بەجێما له دوایان
بۆ دۆست‌و ئاشنایان ؟
(گۆران ، ل ٨٩)

چ باکمە ، مورە کەچەڵە کاکمە
(پەندی پێشینان ، ل ١٧٣)

میری کوتی : «کورینە ئەمە چ بکەین . . . ؟»
(تحفهٔ مظفریه ، ب ١ ، ل ٣١٨)

میر کوتی : « . . . بەکر ئاغا ئەتوو چی دەدەبێ
(تحفەی مظفریە ، ب ١ ، ل ٣١٨)

نەفع‌و زەرەرا خوە ئەو نزانت
یا قەنج ژ بۆ خوەرا چ زانت ؟
(خانی ، ل ٤٨٨)

. . . تو چ ژ من دەخوەزی ؟
(کوردۆ ، ل ٤٣)

نابینی کو پێکفە جملە زددن ؟
حیکمەت چییە ، بۆچ پێکفە نددن ؟
(خانی ، ٢١٤)

چی ل دۆرا وی دبوو دقەومی گشلك فەهم دکر .

(کوردۆ ، ل ٤٢)

**کام / کامە / کێهە / کێها / کێهان / کێژان / کیشك .**

جێناوە ئەم دەستە جێناوە خاوەنی یەك واتان‌و بۆ پرسیاری جوداکردنەوەی کەسێك یان شتێك لەنێو کۆمەڵێکدا دەکرێ .

له زمانی ئەدەبیی کوردیدا فۆرمی (کام / کامە) دەبینرێ . ئەم فۆرمەش له ئاوێستادا له شێوەی «کەتەمە»[١٢] و له فارسی ناوەڕاستدا «کەتام»[١٣] و له فارسیی نوێدا «کودام»[١٤] . . . دا بەرچاو دەکەوێ .

چەند نموونەیەك :

کام بەرزی جوانە وەك بەرزیی باڵای ؟
کام تیشك ئەگاتە تیشکی نێو نیگای ؟
(گۆران ، ل ١٠)

چۆلەکە هازت کامە ؟ تا بازت کام بێ
(پەندی پێشینان ، ل ١٧٦)

له بەشە دیالێکتی موکریان‌و سۆراندا له پاڵ بەکارهێنانی (کام / کامە)دا ، فۆرمی (کێهە / کێها / کێهان)یش[١٥] هەیە :

بەوێنە :

دەبێ له خەویان هەڵبستێنین ، بزانین ، کێهەیان جوانە ، کێهەیان قسان چاك دەزانێ .
(تحفهٔ مظفریه ، ب ١ ، ل ٢٢٩) .

فۆرمی سەرەکیی ئەم جێناوە له دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا «گێژان»ەو له هەندێ ناوچەی بادیناندا شێوەی «کیشك»یش دەبینرێ .

«کێژان» له جێناوی پرسیاری «کێ»و پرێپۆزیشنی «ژێ»و جێناوی کەسیی «وان»ی دۆخی تیان سازبووە[١٦] ، کە واتای (کامە لەوان) دەبەخشێت .

وێنەی ئەم «کێژان»ە له دیالێکتی ڕۆژئاوای زمانی بلووجیدا له شێوەی «کوژان»دا دەبینرێ[١٧] .

چەند نموونەیەك :

. . . ئەز نزانم کیژان ماعر بوو . .

(کوردۆ ، ل ٣٦)

ئەز کەتمە بەختێ تە ، برا هەلە ژمنرە بێژە ، کا تو باوەر دبی ب کیژان سووندانە

(مەمێ ئالان ، ل ٩١)

**چۆن / چلۆن / کوو / چەوا(ن) / چاوا(ن) .**

ئەم جێناوانە بۆ پرسیارکردن لە شتو لە چۆنیەتی رووداو بەکاردەبرێن .

لە زمانی ئەدەبیی ئەمرۆی کوردیداو لە زوربەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجیی خوارووودا «چۆن» فۆرمی سەرەکی یە .

وێنەی ئەم جێناوە لە فارسیی نوێدا «چوون»ە[18] و لە فارسیی ناوەراستدا «چێگۆن»ە (کە لە جێناوی پرسیاری «چی» و «گۆن – واتە «شێوە ، وێنە ، رەنگ» پێکهاتووە)[19] . . .

چەند نموونەیەك :

چۆن دێتەدەر ؟ چۆن ئەرژێ ؟

وا گیان ئەسمێ ، هۆش ئەمژێ ؟

(گۆران ، ل ١٠٣)

ئێستا لە داخا هیچم پێ ناخورێ

ئەوسن چۆن بەرگەی برسێتی ئەگرێ ؟

(پیرەمێرد ، ل ١٦٥)

بێرو هاوێری لەگەڵ کاکی نەکردبا بێشك

چۆن دەمان بوو ئەو هەموو گۆشتو پەنیرو بەرگنە ؟

(تاریكو روون ، ل ٧١)

لە فۆلکلۆرو ئەدەبیاتی کۆنو زمانی ئاخاوتنی ئەمرۆی ناوچەی موکریاندا[20] «چلۆن» فۆرمی سەرەکی یە . ئەم فۆرمی «چلۆن»ە لە بەشێکی زۆری ئەدەبیاتی کۆنو بەشێکی کەمی ئەدەبیاتی ناوچەی سلێمانیشدا دەبینرێ .

بەوێنە :

دەروێش کوتی : «شاە عەبباسێکی لە ئیسفەهانێ ، ئەمنێکی لێرە ، چلۆن بە بەختی وی بچم ؟» . . .

(تحفهٔ مظفریه ، ب ١ ، ل ١٨٠)

« . . . کاکە مەمی چلۆن بەتلێنین ، قەرەتاژدین ، عرفۆ ، چەکۆ پێ نەزانن ؟» .

(تحفهٔ مظفریه ، ب ١ ، ل ٣١٨)

وا ظەن مەبە روخسارەیی تۆ غائیبە قوربان

بنوارە چلۆن نەقشە لە نێو دیدەیی تەرما

(نالی ، ل ١٢١)

یا ئەپرسین ، یا ئەگرین ،

ئیتر چلۆن بخوێنین ؟

(گۆران ، ل ١٠٨)

لە ناوچەی سوران جگە لە «چۆن» و «چلۆن» ، هەروەها «کوو»ش زور بەرچاو دەکەوێ . ر . ل . تسابۆلۆف لەبارەی ئەم جێناوەوە نووسیوێتی : «رەنگە پێوەندی بە (کووە – kuwa)ی ئاوێستاییەوە هەبێو (و –w ) بووبێ بە (هـ – h)و دواییش سوابێ[21] .

بە نموونە :

لە قرژاریان پرسی کوو بە هەردوو سەران دەرۆی ؟

گوتی چ لە لاوان بە عەیب ناگیرێ .

(پەندی کوردی ، ل ٧٤)

فۆرمی «چەوا (ن)» / «چاوا(ن)» سەر بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروووە . وەك :

پادشا ژعەلی مەمەد پرس کر گۆت : «بێژە ، چاوا بوو ، کو تە گولە ل قیزا من خست ، بێژە مەعنیا وێ چ بوو ؟» .

(کوردۆ ، ل ٤٠)

دگۆتن : «ئەمێ چاوا ژ بۆ دەردێ وی ببین دەرمانە ؟» .

(مەمێ ئالان ، ل ١٣١)

ل حەسەن ڤەگەرێ ، گۆتی : «برا ، ڤێ جارێ گۆتنا تە چاوانە ؟»

(مەمێ ئالان ، ل ١٢٧)

**کەی / کەنگێ / کەنگی / کەنگین / کەنگینێ / کەینێ .**

له ناوچەی سلێمانیو هەندێ هەرێمی دی تەنیا «کەی» بەکاردێنرێ. لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا «کەنگێ» و «کەنگی» دەوترێ. لە ناوچەی موکریانو سۆراندا جگە لە کەنگێ»و «کەنگی». فۆرمی «کەنگێن»و «کەنگینێ»و «کەینێ»یش بەرچاو دەکەون.

چەند نموونەیەك

کەی تۆم دیوە؟ کەی ئەتناسم؟ کەی؟ کەی؟ کەی؟
دڵداری چی؟ پەیمانی چی؟ حەی! حەی! حەی!
(گۆران، ل ٢٧)

دیلی، ژێردەستی، ئەسیری، تا کەی؟
ڕووتی، نەداری، فەقیری، تا کەی؟
(تاریكو ڕوون، ل ٥٠)

کاکە گیان لاوی کوردی شۆخو شەنگ
تا کەنگی دەبێ وا بێ هەستو دەنگ
(تاریكو ڕوون، ل ٥٠)

کەنگێ ژ مەرا دبت مویەسسەر
خالق ژ ئەزەل نەکەن مقەددەر؟

(خانی، ل ٤٧٦)

بە داو دەکەن پێکۆڵێ
وەردەرکەوت لە ئەستەمبووڵێ،
کەنگێ وەکەم وێ تۆڵێ؟
(تحفهٔ مظفریه، ب ١، ل ٢١٨)

بە منداڵی پەیوەستی، بە جاعێری سەربەستی
بە پیری کەی هەڵدەستی؟
(پەندی کوردی، ل ٢٥)

**کوا / کوانێ، کا / کانێ**

بۆ پرسیار لە کەسو شت بەکاردێنرێن.
«کوا / کوانێ» سەر بە دیالێکتی خواروونو «کا / کانێ»یش سەر بە دیالێکتی ژووروون.

بەوێنە:

ئەی چاو! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەرێ پەرت،
کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دلبەرت؟
کوانێ دوو چاوی مەست؟ کوانێ
کوانێ بڕۆی پەیوەست؟ کوانێ
کوانێ زوڵفی ڕەش؟
کوڵمی ئاڵو ڕەش؟
کوا هەیکەلی جەمال؟
کوا حوسنی بێ میثال؟
(گۆران، ل ١٣)

کوانێ سواری دەنازەنین؟
کێ بوو؟ لە ئاڵی ئادەمان
قەڵاتی هەڵگرت بە زەمان
(تحفهٔ مظفریه، ب ١، ل ٢١٦)

وەرە ئێرەو مەپرسە تۆ ئەدی چارشێوو ڕووبەند کوان؟
وەرە ئێرە ببینە چاوی مەستو بەژنو باڵای جوان
(تاریكو ڕوون، ل ٦١)

کاڵێ بۆوە پەنجەی جوانان
کوانێ گەمەی جێ ژوانان؟
(تاریكو ڕوون، ل ٩٥)

...کا ڤاریۆخا تە؟ ئەز وێ نابینم...
(کوردۆ، ل ٩٢)

کا ئەو چاوا چێکرنە؟
(جیمو گولپەری، ل ١٦)

کانێ ل مە ئاشە، یانە زیزە؟
باخێ وی بوهارە، یا پاییزە؟
(خانی، ل ٣٤٨)

فۆرمی «کا» لە ناوچەی سۆرانیش بەکاردێ.

بەوێنە:

ەڵێی کا ماڵت ؟ ناڵێم کا قەبرت

(پەندی کوردی ، ل ٨٥)

**کوێ / کێ / کێندەر / کوێندەرێ / کیرێ / کیدەرێ / کوێدەرێ / کوو .**

ۆ پرسیاری شوێن‌و جێگە بەکاردێن .

له ناوچەی سلێمانی‌و موکریان‌و هەندێ هەرێمی تری دیالێکتی خوارووی کوردیدا تەنیا فۆرمی (کوێ) دەبینرێ . له ـوچەی هەولێرو کۆیەو ناو شوان فۆرمی (کێندەر / کوێندەرێ)[٢٢] باوە . . . فۆرمی «کیرێ / کیدەرێ / کوێدەرێ / کوو» له ناوچە جیاوازەکانی دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەبینرێن .

چەند نموونەیەك بۆ وێنەی کرمانجیی خواروو :

. . .پەح ئەمە چی بوو من دیم ، من له کوێم ، ئەمە خەوە ـن نا ؟

(له خەوما ، ل ٥٧)

ـە ناو کورددا نەبوو پەیمان شکاندن
ـە کوێ فێربووی گوڵم پەیمان شکێنی ؟

(تاریك‌و روون ، ل ١٢٩)

دەوڵەمەند پیرۆزت بێ ، فەقیر له کێت بوو ؟

(پەندی کوردی ، ل ٤٦)

ـێتان شێتەبن دەچنە سەر ئۆمەرمەندان ، ئۆمەرمەندان شێت ـێ بچێتە کێندەر ؟

(پەندی کوردی ، ل ٦٠)

چەند نموونەیەك بۆ وێنەی کرمانجیی ژوورووو :

. . .تە ئەو ژ کیدەرێ ئانییە ؟

(کوردۆ ، ل ٨٣)

. . . ئەڤ رێ دچن کوو[٢٣] ؟

(کوردۆ ، ل ٩٦)

. . . پرسی : «تو کیی ؟ کوو هاتی هەوارییا من ؟

(کوردۆ ، ل ٦٥)

. . . گۆت : «هەڤالۆ خوەندەگەها کەچان ل کوویە ؟

(جیم‌و گولپەری ، ل ٦)

**چەند / چەن / چەنگ**

ئەم جێناوە بۆ پرسیاری ئەندازەو ژمارە . . . بەکاردێ . (چەند) له هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا وەك جێناوی پرسیارو جێناوی چەندێتی دەبینرێ .

وێنەی ئەم جێناوە له ئاوێستادا «چڤەتت»[٢٤] ، له فارسیی کۆندا «چیەنت»[٢٥] ، له فارسیی ناوەراستدا «چەند»[٢٦]ە .

له بەشە دیالێکتی سلێمانیدا شێوەی «چەن»و «چەنگ»یش بەرچاو دەکەوێ .

نموونە :

هندی ئەوی راکرن سەلاطین
دەهـ چەند ئەوی چی‌کرن شەیاطین ؟

(خانی ، ل ٢١٨)

پێم بڵێ تو خوا چەند جوانت دی ؟
چەند جووتە یاری دەس له ملانت دی ؟

(بێکەس ، ل ١٥٢)

خوێنی کوڵمی چەن گەش بوو ؟
چاوو برۆی چەن رەش بوو ؟

(گۆران ، ل ٨٩)

تایبەتێتی‌یەکی دیاری جێناوی پرسیار له زمانی کوردیدا ئەوەیە زوربەیان له جێناوەوە دەتوانن ببن بە بەشە ئاخاوتنی تر ، یاخود له جێناوی پرسیارەوە ببنە گرووپێکی دی جێناو .

بەوێنە له رستەی وەك : «چۆن بە باش دەزانی ، وابکە» ، «چۆن هێنات وەها بیبەرەوە» . . . دا «چۆن» بووە بە ئامرازی پێوەندی‌و دوو رستەی بەیەکەوە بەستۆتەوە بێ ئەوەی هیچ پرسی تێدا بێ . . . وشەی «کەی» له رستەی وەك : «کەی زستان هات ، بەفریش دەبارێ» ، «کەی شێرکۆ هاتەوە ، بەپیریەوە دەچین» . . . دا ، کە دوو رستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە ، ئەو واتایە بەدەستەوە نادات ، کە له باری

پرسیاردا به دەستیەوە دەدات ، چونکە لێرەدا پرسیار نی یە –
و تە لێرەدا (کەی) جێناوی پرسیار نی یە . بەڵکو ئامرازی
پێوەندی یە .

نە سەرەوە لەوە دواین کە (چ) جێناوی پرسیارەو بۆ پرسیار
نە شتو هۆی ڕووداو بەکاردێنرێ ، بەڵام کاتێ بە واتای
(هیچ) دێت . ئەوە دەبێتە جێناوی نەفی . بەوێنە :

بەکر ئاغا کوتی : «قوربان ئەمن چ نادەم» .

(تحفۀ مظفریە ، ب ١ . ل ٣١٨)

ئەتوو هێشتا شکلی نحۆیێ گەرگەری چ جارەکی بە چاوی
سەرێ خو ڕا نەدیتیە .

(فۆلکلۆر . ل ٢١٠)

یاخود وشەی (چەند) کاتێ بۆ پرسیاری ئەندازەو ژمارە
بەکاردێنرێ جێناوی پرسیارە ، بەڵام دەمێ پرسیاری پێ ناکرێ
دەبێتە جێناوی چەندێتی ، وەك :

. . . زور هیلاکو ماندوو بووم . لە پاش چەند سەعاتێك هێز
نە ئەژنۆم بڕا . . .

(لە خەوما ، ل ٢٩)

گۆت : «چەند ڕۆژا شووندا ئەزێ ژ تەڕا بێژم» .

(کوردۆ . ل ٤٥)

. . . هتد .

جێناوی پرسیاریش ، هەروەك جێناوی خۆیی ، جێناوی
لکاو وەردەگرێ ، بەنموونە :

١ – جێناوێکی دەستەی یەکەمی دەچێتە سەر ، وەك :

چی + م ⟵ چیم

من ئومێدی چیم هەبوو ، کەچی چیم دیو چیم بیست .

چی + مان ⟵ چیمان

بۆچی زاین ؟ کەی ، چۆن ئەمرین ؟

چیمان لێ دێ کە ئەمرین ؟

(گۆران ، ل ١٠٧)

کام + ی ⟵ کامی

ئێمە مایەی چوار سروشتین : ئاوو ئاگرو خاكو با

ئەم هەوێنە کامی زیاتر بێ ، بەلای ئەویا ئەبا

(پیرەمێرد ، ل ٢٩٠)

٢ – یەك جێناوی دەستەی دووەم وەردەگرێ . وەك :

کێ + ن ⟵ کێن

. .وتیان مەڕۆن بزانین ئێوە کێن . . . ؟

(لە خەوما ، ل ٣٢)

کوێ + م ⟵ کوێم

پەح ئەمە چی بوو من دیم ، من لە کوێم ، ئەمە خەوە یان
نا ؟

(لە خەوما ، ل ٥٧)

٣ – دوو جێناوی دەستەی یەکەمی پێوە دەلکێ ، وەك :

کێتانمان ، چیتانمان . . .

٤ – جێناوێکی دەستەی یەکەمو بەدوایدا هی دووەم ،
وەك :

چیمانن ، چیتن . . . .

٥ – کاتێ جێناوی پرسیار جێناوی لکاوی دەچێتە سەر چ لە
پێشو چ لە پاش جێناوەکەوە مۆرفیمی (ش /یش) دەتوانێ
وەربگرێ . وەك :

أ) لە پێش جێناوەکەوە :

کێشم ، کێشتان . . . چیشم ، چیشتان . . . . کامیشم ،
کامیشتان . . . چەندیشم ، چەندیشتان . . .

ب) لەپاش جێناوەکەوە :

کێتانیش ، چیتانیش . . .

**پەراوێزەکان :**

(١) – بڕوانە : س . ن . سۆکۆلۆڤ ، زمانی ئاوێستا . مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٦٦ .

(٢) – بڕوانە : ڕ . ل . تسابۆلۆڤ ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردیەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٣٠

(٣) – بڕوانە : ف . س . ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ،

- ٦٥-٦٦ .

٤) - بڕوانە :

ذو النور ، دستور پارسی در صرفو نحوو املای فارسی ، تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٣٢ .

ب ـ علی برناك ، دستور زبان فارسی ، ١٣٤٧ ، ل ٣٤ .

٥) ف . ئا . فورولۆڤا ، زمانی بلووجی ، مۆسكۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٣٤ .

٦) - بڕوانە : ك . ر . ئەیووبی‌و ئی . ئا . سمیرنۆڤا ، دیالێكتی كوردی موكری ، لێنینگراد ، ١٩٦٠ . ل ٤٨ .

٧) بڕوانە : ق . كوردۆییڤ ، دەستووری زمانی كوردی ، موسكۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٠٥ .

٨) - بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، سۆكۆلۆف ، ل ٦٦ .

٩) - بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ڕاستۆرگویڤا ، ل ٦٧ .

١٠) - بڕوانە :

- سەرچاوەی ناوبراو ، ذوالنور ، ل ٣٣ .

ب - سەرچاوەی ناوبراو ، علی برناك ، ل ٣٤ .

١١) - بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، فورولۆڤا ، ل ٣٤ .

١٢) - بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، سۆكۆلۆف ، ل ٦٦ .

١٣) - بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ڕاستۆرگویڤا ، ل ٦٨ .

١٤) - بڕوانە :

- سەرچاوەی ناوبراو ، ذوالنور ، ل ٣٤ .

ب - سەرچاوەی ناوبراو ، علی برناك ، ل ٣٥ .

١٥) - ئەم جێناوە لە دیالێكتی ڕۆژهەڵاتی زمانی بلووجیدا لە شێوەی «كیان»دا دەبینرێ (بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، فورولۆڤا ، ل ٣٤) .

(١٦) - بڕوانە :

- ف . كوردنیێڤ ، دەستووری زمانی كوردی (بەكەرەستەی دیالێكتی كرمانجی ژووروو حواروو ، مۆسكۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١١٥ .

ب - چ . خ . باكاییڤ ، زمانی كوردەكانی سۆڤێت ، مۆسكۆ . ١٩٧٣ ، ل ١٥٥ .

ج - سەرچاوەی ناوبراو ، تسابۆلۆف ، ل ٣٠ .

(١٧) - بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، فورولۆڤا ، ل ٣٤ .

(١٨) - بڕوانە :

- سەرچاوەی ناوبراو ، ذوالنور ، ل ٣٤ .

ب - سەرچاوەی ناوبراو ، علی برناك ، ل ٣٥ .

(١٩) - بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، تسابۆلۆف ، ل ٣٠ .

(٢٠) - كەریمی ئەیووبی‌و سمیرنۆڤا لە كتێبی «دیالێكتی كوردی موكری» (لێنینگراد ، ١٩٦٨)دا بە هیچ چەشنێك ناوی «چلۆن»یان نەبردووەو بە هەڵە فۆرمی «چۆن»یان بە فۆرمی سەرەكی داناوە .

(٢١) - بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، تسابۆلۆف ، ل ٣٠ .

(٢٢) - لە شێوەی سلێمانیدا ، ئەو فۆرمە ناوە ناوە لە هەندێ باردا دەبینرێ ، وەك ئەوەی دەوترێ : «فلانە كەس كوێندەری»یە .

(٢٣) - فۆرمی «كوو» لە شێوەی لوڕیشدا بەكاردێ .

(٢٤) -

A. V. William Jackson, Avesta Grammar, Part 1, Stuttgart W. Kohlhammer. 1892, P. 114

(٢٥) - بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، تسابۆلۆف ، ل ٣٠ .

(٢٦) - بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ڕاستۆرگویڤا ، ل ٦٨ .

• •

**نیشانەی نموونەكان :**

١ - (بێكەس)

دیوانی بێكەس ، محەمەدی مەلا كەریم ڕێكی‌خستووەو سەرەتای بۆ نووسیوەو سەرپەرشتی لە چاپدانی كردووە ، چاپی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٢ - (پەندی پێشینان)

پەندی پێشینان ، كۆكردنەوەی شێخ محەمەدی خاڵ ، چاپی دووەم ، ١٩٧١ .

٣ - (پەندی كوردی)

عومەر شێخەڵا دەشتەكی ، پەندی كوردی ، هەولێر ، ١٩٧٢ .

٤ - پیرەمێرد)

پیرەمێردی نەمر ، محەمەد ڕەسووڵ هاوار ، بەغدا ، ١٩٧٠ .

٥ - (تحفة مظفریە ، ب ١)

ئۆسكارمان ، تحفة مظفریە ، بەرلین ، ١٩٠٥ ، پێشەكی‌و ساخكردنەوەو هێنانە سەر ڕێنووسی كوردی هێمن موكریانی ، بەشی یەكەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٦ - (جیم‌و گولپەری)

جگر خوێن ، جیم‌و گولپەری ، شام ، ١٩٤٦ .

(٧) - (خانی)

ئەحمەدی خانی ، مەم‌و زین ، ئەستەمووڵ ، م .

بۆز ئەرسەلان لە چاپی‌داوە .

٨ - (فۆلكلۆر)

فۆلكلۆری هۆنراوەكانی كوردەواری ، كۆكردنەوەی محەمەد كەریم شەریف ، كەركووك ، ١٩٧٤ .

٩ - (كوردۆ)

كۆمەڵە تێكستی فۆلكلۆری كوردی ، پرۆفیسۆر قەناتی كوردۆ لە زاری كوردەكانی سۆڤیەتەوە تۆماری كردوە . شوكور مستەفاو ئەنوەر قادر هێناویانەتە سەر ڕێنووسی كوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

١٠ - (گۆران)

سەرجەمی بەرهەمی گۆران ، بەرگی یەكەم ، دیوانی گۆران ، محەمەدی مەلا كەریم كۆی‌كردوەتەوەو ئامادەی‌كردوەو پێشەكی‌و پەراوێزی بۆ نووسیوە ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

١١ - (لە خەوما)

جەمیل صائب ، پێشكەش‌كردن‌و لێكۆڵینەوەی جەمال بابان ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

١٢ - (مەمێ ئالان)

مەمێ ئالان ، چیرۆك نفیس كۆی‌كردووەتەوەو پێشەكی بۆ نووسیوە ، صالح عەلی گوڵی‌و ئەنوەر قادر محەمەد لە ڕێنووسی لاتینی‌یەوە هێناویاناتە سەر ڕێنووسی كوردی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

١٣ (نالی)

دیوانی نالی ، لێكۆڵینەوەو لێكدانەوەی : مەلا عبدالكریمی مدرس‌و فاتح عبدالكریم ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

١٤ - (تاریك‌و ڕوون)

هێمن ، تاریك‌و ڕوون ، گوڵبژێرێك لە شیعرەكانی هێمن ، بەغدا ، ١٩٧٤ .

هەردەوێل کاکەیی [١]

# هیجری دەدەی کاکەیی «١٨٧٧ - ١٩٥٢ز»

هیجری دەدە ناوی مەحموود کوڕی مەلا عەلی کوڕی مام نەزەر کوڕی مام قەیسەری کاکەیی یە . ناوی دایکی زەینەبە . لە ساڵی ١٨٧٧ی زدا لە شاری کەرکووك لە خێزانێکی ئاین پەروەر بۆ یەکەمجار چاوی هەڵهێناوەو هاتووەتە رووی جیهان . لە تەمەنی (١٤) چواردە ساڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە .

هیجری شاعیرێکی بەناو بانگە . زۆر کەس لە قەڵەم بە دەستانی کوردو تورکمان لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا زانیاریان دەربارەی ئەم کەڵە شاعیرە نووسیوەو هەموویانیش شانازی پێوە دەکەنو بە شاعیرێکی پایەبەرزی لە قەڵەم دەدەن .

شاعیر کوردیو عەرەبیو تورکیو فارسی گەلێ بەباشی زانیوە . شیعری بەکوردیو تورکیو فارسی وتووە بەڵام زۆربەی ئەو شیعرانەی کە چاپ کراوە تورکیو فارسی یە . نازناوی (هیجری) بۆ شیعر نووسین هەڵبژاردووە . گەلێ بەرهەمی لە پاش بەجێ ماوە بەشێکیان لە چاپ دراوەو بەشێکیانیش تائێستا بلاو نەکراوەتەوە لەوانە کۆمەڵە شیعرە کوردی یەکانیەتی . نووسەری تورکمان مامۆستا ( عبداللطیف بندر أوغلو) لە ل (٣٥)ی کتێبی (هجری دده) لە ئامادە کردنو نووسینی مامۆستا (آیدن عبدالقادر عبدالجبار)ەو لە سەر ئەرکی دەزگای رۆشنبیری تورکمانی لە ساڵی ١٩٨١ی ز بلاو کراوەتەوە دەڵێت : لە ساڵی ١٩٦٠ی ز کۆڕێکی ئەدەبی لە بەغدا بەسترا بۆ ئەدیبانی تورکمانی لەو کۆڕەدا گەلێ شاعیرانو رووناك بیران ئامادە بوون لەوانە شاعیری بەناو بانگ (محمد مهدی الجواهری)و شاعیری بەناو بانگ (عەبدوڵلا گۆران) وەهەردوکیانیش دەرهەق هیجری دەدە وتاریان خوێندەوە .

مامۆستا (عطا ترزی باشی) لە ل (١٠)ی هەمان سەرچاوە دەڵێت : هیجری دەدە (٢٢) کتێبی داناوە هەندێکیان بلاو کراوەتەوەو زۆربەیانیش تائێستا چاپ نەکراوە لەوانە کۆمەڵە شیعرە کوردی یەکانیەتی .

شاعیرمان خوێندنی لە کەرکووك لای ئەم زاتانەی خوارەوە تەواو کردووە :-

«مەلا محەمەد ئەفەندی . مەلا رەزا ئەفەندی . عەلی حیکمەت ئەفەندی» . بەلام وانەی رێبازی کاکەیی لەم زانا ئاینی یانەی کاکەیی وەرگرتووە «مەلا فەتۆش - (فتح الله) کوڕی حەویش . مەلا زەینەل . سەی محەمەد عەبەلە . سەی سلێمان پەلکە زێرین» .

مەحموود هیجری لە ساڵی ١٩١١ی ز بووەتە مامۆستا لە قوتابخانەی (السلطانیه) لە کەرکووك ماوەی سێ ساڵ لەم قوتابخانەیە کاری کردووە . لە پاش ئەوەی ئینگلیز عێراقی داگیر کرد ئەو قوتابخانەیە داخراوەو شاعیرمانیش تووشی گەلێ کۆسپو نارەحەتی بووە وە پاش کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم دیسان کرایە مامۆستاو لە قوتابخانەی (القلعه) لە کەرکووك .

شاعیر بووەتە بەرێوەبەری رۆژنامەی (کەرکووك) لە ژمارەی (٦٦)ەوە . ئەو رۆژنامەیە (٤٦) ساڵ بەردەوام بووە لە دەرچوون لە ساڵی (١٩٢٦ز)ی یەوە تا ساڵی ١٩٧٢ی ز .

هیجری جگە لەوەی شاعیرە رۆژنامە نووسیش بووە . زانایەکی پایەبەرزی بەناوبانگی ئاین پەروەری (کاکەیی)یش

بلاْوكرايێتەوە بە بۆچوونی خۆم دیوانەکە زۆر شیعری (نالی) کە لە دوای گەڕانەوەی لە حەج و لە وولاتی غەریبی شام دایناون تێدا بووە. لە کۆتایی ئەم نووسینە هەندێ پەراوێز لە سەر پێنج خشتەکی (هەر چەند نەفەس موضطەریبی . . .) دەخوێنرێنەوە پێنج خشتەکیەکە دەکەن بە یەکێ لە شیعرەکانی ئەم قۆناخەی ژیانی (نالی).

لە (زنکۆگراف) ڕا دیارە چوار لاپەڕەکە بە خەتێکی خۆش و بێ گرێ و شیوە نووسینی فارسی نووسراون. لە خەتەکە ڕا دیارە نووسەرەکەی لە ئاستێکی باش یا بە لانی کەم مام ناوەندی خوێندەواری دابووە. جار جارە چاو دێری جیاوازی تێکستی کردووەو دووەمەکەی لە سەرەوە نووسیووەو (خ)ێیکی بە دواوە نووساندووەو. هەروەها سەرو ژێریشی بۆ هەندێ وشەی ناهەمواری خوێندنەوە کردوە. وەك (سوخورمەی) سەرەتای دێری حەوتەمی مەسنەوییەکە. بەرینی و درێژی لاپەڕەکان نزیکەی (٨ ١٤) سم.

## سەردەمی نووسینەوەیان

چوار لاپەڕەکە وەك لە (زەنکوگراف) دا دەردەکەوێ دەبێ بەر لە دانانی نیشانەکانی (ە)و (ی) و (و) بۆ (سەر) و (ژێر) و (بۆر)ی کوردی نووسرابنەوە. ئەوەی لە بواری ڕێنووسەوە پێویست بێ بگوترێ ئەمەیە: کە نووسەر بۆ جیاکردنەوەی پێی (گ) لە (ك) سێ نوقتەی لە سەر یەکەم داناوە.

جا ئەم نیشانەیە کەی لە ڕێنووسی کوردی رەچاو کراوە؟ نازانم.

هەر کەی بێ دەبێ چوار لاپەڕەکە لە سەرەتای دانانی نیشانە کە نووسرابنەوە. چونکە دیارە نووسەر دەستی پێی ڕا نەهاتووەو لەو هەموو (گ) پیانەی چوار لاپەڕەکە تەنیا لە «گ)ی (زگ)ی سەرەتای دێری دووەمی (هەی کەرێکم بوو . . .) سێ نوقتەکەی رەچاو کردوە. کەچی لەو هەموو (گ) پیانەی مەسنەوی (خوداوەند دەخیلت بم وەکو سەگ) لەبیری چووە.

## سوود گەیاندن و خزمەتکردنیان بە دیوانی نالی

ناوەڕۆکی چوار لاپەڕەکان دوای ساغ کردنەوەیان ئەگەر بسلمێندرێ بە موڵکی (نالی) لە قەڵەم بدرێن. لە چەند ڕوویێکەوە خزمەتی (نالی)و دیوانەکەی دەکەن:

١ – لە ژێر تیشکێکی باریکی ڕووناکی کە لە کولانکەی ئەم چوار لاپەڕانەوە دا دەرژێتە نێو دیوانی (نالی) چەند شیعریکی بلاْو نەکراوە دەخوێنینەوە.

٢ – بۆ یەکەم جار - وەك ئاگادارم - ئەدەب پەروەران و (نالی) دۆستان دیدار شاددەبن بە چەند پێنج خشتەکی و مەسنەوێیك لە جیهانی پان و بەرینی ئەدەب و شیعری (نالی).

٣ – بینینی (نالی) لە مەیدان و ئەزموونی کردن بە پێنج خشتەکی (تخمیس)دا. کەوا بزانم بە دەگمەن شاعیرێکی کلاسیکمان دەستناکەوێ ئەسپی خۆی لەم مەیدانەدا تاو نەدابێ. بە تایبەتی شاعیرە سەرکەوتووەکان بۆ نیشاندانی شاعیریان و خۆ تاقیکردنەوەو خۆ هەلکێشانیان. چونکە هەروا ئاسان نییە شاعیر یان هەر ئینسانێ لە قالبی خۆی دەربچێ و بچێتە ناو قالبی یەکێکی دی. کەواتە سەیر نییە (نالی) شایی بە خۆ هاتوو حەز لە تاقیکردنەوە هەروەك خۆی دەڵێ:

طەبعی شەککەر باری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا
ئیمتیحانی خۆیە مەقصودی لەعەمدا وا دەکا

دڵنیاشم هەر مەبەستی خۆ تاقیکردنەوەو خۆ هەڵکێشان هانی داوە بۆ (تەخمیس) کردنی شیعری فارسی – دیارە ئەدەبی فارسیش لە قوتابخانە سەرەکییەکانی ئەدەبی زۆژ هەلاتە - لە شیعری فارسیش شیعری (حافظ) کە لە کەڵە شاعیرەکانی فارسە – هەڵبژێرێ.

## ساغ کردنەوەی شیعرەکان

ساغ کردنەوەی شیعری کلاسیکی هەر وا کارێکی ئاسان نییە بە هەموو کەس بکرێ. چونکە ساغ کەرەوە تووشی زۆر کۆسپ و تەگەرە دەبێ لەپێش هەموویانەوە ژیانی نە زانراوو، ئاستی زانایی و خوێندەواری شاعیرو. دوایی گیرو گرفتەکانی

ـنووس و ناوەرۆك و . . . تاد .

بۆیە پێویستە بڵێم : ئەو شوێنانەی هێنراون بۆ سەر ـنووسی ئیستای کوردی لە گومان دوورو بڕیاری براوەنین و ، ئەگەر بە شێوەیێکی جوانترو گونجاو لە گەڵ تیکستە دەستنووسەکە بخوێندرێنەوە ئەوا خزمەتێکی زۆری ئەدەبی کوردی و (نالی) دەکرێ .

لە نووسینەوەی شیعرەکاندا ئەو وشە لێکدراوانەو رستانەی ـەر قەو عیدی عەرەبی دەکەون هەر بە رێنووسی عەرەبی نووسراونەتەوەو لە نێو دوو جووت کەوانە داو . ئەوانەی پێم ـغ نەکراوتەوە وەك خۆی و لە ناو دوو کەوانەدا نووسراون و ئەو نەی دوو دڵم لە خوێندنەوەیان و . یا زیاتر لە خوێندنەوەیێك هەڵبگرن خەتم بە ژێر دا کێشاون .

ئیتر هیوا دارم لە ساغ کردنەوەی شوێنە ساغ کراوەکان سەرکەوتوو بوو بم ، خۆ ئەگەر بە سەر سەریشدا کەوتبم ئەوا رزگار کردنی ئەم چەند . دێرە شیعرە لە چنگاڵی شەو زەنگی تاریکی ناو کۆنە کتێب . داوای لێ بووردنم لە گیانی نەمری (حەضرەتی نالی) و . خوێنەران دەکەن .

**شیعرەکان**

**(١)** [٥]

؟ – «ماء الحیواة»ی صۆفی (شرب)ە لە شانە هەنگوین [٦]
«کأس الکرام»ی (نالی) ماچە لە لێوی نۆشین
ئەی شەمعی مەجلیسی جەم ئەی شۆخی خوسرەو ئایین [٧]
(حافظ) چو طالب امد جای بجان شیرین
«حتی یذوق منه کأسا من الکرامه»

**(٢)** [٨]

١ – هەر چەندە نەفەس موضطەریبی هات و نە هاتە
نەفسی دەنی یە عازیمی بێ عەهدو ئەباتە
ئەمما سەرەکەی موخلیصی خاکی کەف و پاتە
خۆ دڵ ئەزەلی قومریی بێ باڵە لە لاتە
خۆ جان ئەبەدی حاضری قاپی حەضەراتە
٢ – گریەی سەحەرم جۆششی فەوواری ویعایە [٩]
غەوطی [١٠] جگەرم پۆششی بانیاسی خەفایە
قاعاتی سەرم مەنبەعی ئەسراری وەفایە
هێشتا لەبەر ئەو (مرجە ؟) دەروونم (بردایە ؟)
ئێستەش لە بەر ئەم قاپی یە چاوم قەنەواتە
٣ – بەو نووری جەمالە کە نەما صەبری جەمیلم
بەو قامەتەکەم راستە کەوا خوارو زەلیلم
بەو چاوە قەسەم بێخودو بیمارو عەلیلم
رازی نەبی ئەی عومری گرانمایە دەخیلم
لەم غوربەتە بمرم کە حەیاتم بە وەفاتە
٤ – هەر چەندە (لمی ؟) صابیری ئەییوبم و مەفتوون
گەە دایری دەریام و گەهێ مەرکەزی هاموون
ئەمما لە ئەزەل چونکە بە دڵ قەیسم و مەجنوون
خاکی قەدەم و رێگەیی سەر رەبوەوو قەیسون [١١]
نادەم بە هەموو جەوهەرو [١٢] ساعاتی قەلاتە
٥ – کوا غۆطەوو [١٣] (عنترمە ؟) و ئەنهاری نەظارەت
کوا نوورو قەنادیل و مەنارات و ئیشارەت
کوا بابی سەلام و گوزەری حەجج و تیجارەت [١٤]
کوا زەینەبی یە [١٥] وجەبهەو وخلخال و عیمارەت
کوا دامەنی مەرزی کە نمونەی عەرەفاتە
٦ – کوا . . . ؟ [١٦]

**(٣)** [١٧]

١ – «صدق لعلو مطلبی یعنی لمعراج النبی»
یان ئەو شەوە مونکیر نەبی ئەرزیش کەوا گەییە سەما
٢ – لەو لەیلە داپیرە فەلەك مەحبوبەیێك بوو چاو بەڵەك
ئەستێرەکانی یەك بە یەك بوو بوون بە بەدرو شەو چرا
٣ – مەوصوفی «مازاغ البصر» (دیهیم ؟) لەو لاك لە سەر
تەشریفی قورئانی لەبەر جبریلی مەئموورە لە لا

**(٤)** [١٨]

هەیکەلێکم بوو چو پەیکەر . . . تاد

## (٥) (٥)

١ - خوداوەندا دەخیلت بم وەکو سەگ
سەگێکی دوو ڕەگ بەد ڕەنگ و بەد ڕەگ
٢ - کە وەحشی بێ لەڕاو و پاسە بانی
( عم بوبی باسم نانی ؟ ! )
٣ - چەوێل سست،و پاشل پووچ و شل بێ
شەل‌و چوار چاو و نەحس‌و کاژلە مل بێ
٤ لمووزو سیرمە خوارو چاوی هار بێ
لە دومان دائیما ماندی هەوار بێ
٥ - (کرول موئماو ؟) گێژی هێری
گەڕولک‌و رووت‌و پێ سوتاو و وخوێری
٦ - بە جەستە یوە نەما بێ سەر لە بەر موو
مەگەر چاوی کەوا کوێر بێ لە بەر موو
٧ - سوخرمەی هەندی لە بن دەستی درا بێ
لەبەر کرمان خورا بێ دا خوڕا بێ
٨ - طەرید . . .

### پەراوێزەکان

(١) وەك لە لاپەڕە (٣٢)ی (تاریك وڕوون)ی مامۆستا هێمن دەیخوێنیتەوە .

(٢) دیوانی نالی . مەلا عبدالکریمی مدرس . بغداد . ١٩٧٦ . ل ٢٤ .

(٣) سەرچاوە پێشوو . ل ٣٧ .

(٤) هەمان سەرچاوە . ل ٢٠١ .

(٥) بەڵگەی مادی‌و مەحسووسی بە (نالی)ی دانانی ئەم (تەخمیس)ە خوێندنەوە ناز ناوە کەیەتی لە دێری دووەم . بە داخەوە ئەم (تەخمیس)ە نا تەواوەو . ئەوەی لێرەدا نووسراوە پێنج خشتەکی هەرە کۆتاییەو . ئەوانەی (حافظ) دەخوێننەوە دەزانن چەندی لێ فەوتاوە .

(٦) تێکستە کە ڕێگەمان دەدا بەم شێوەیەش بخوێندرێتەوە :
(ماءالحیاة)ی صۆفی شەربەتی شانە هەنگوین) . بەلام من یەکەمم هەڵبژارد تا لەگەل (کاس ئکرام)ی ماچە لە لێوی نۆشین)ی دێری دووەم گونجاو ترێ .

(٧) بۆرێکی کێش دەبێ (خووسرەوایین) بخوێندرێتەوە .

(٨) ئەم پێنج خشتەکیانە هەر چەندە ناز ناوی (نالی) یان تێدا بەر چاو ناکەوێ چونکە لە کۆتایی فەوتاوە - کەچی مۆری مادی (نالی) بوونیان هەر پێوەیە . چونکە لە دەستنووسەکەدا لە دوو پێنج خشتەکی‌یەکەی (نالی) و دەگەڕێتەوە بۆ (نالی) واتە : هەر هی ئەوە .

(٩) تێکستەکە ڕێگەمان دەدا بەم شێوەیەش بیخوێنینەوە : (گریەی سەحرم جۆشتی فەوواری دوعایە) .

(١٠) لە (المنجد) دا دەڵێ : «غاط یغوط غوطا الحفرة : حفرها» . وا بزانم ئەم مەعنایە لەگەل (پۆشتی بانیاسی خەفایە)دا دەگونجێ . خۆ (چاڵ) شوێنی شاردنەوەو حەشارگەیێکی چاکە . بە داخەوە لە هەموو فەرهەنگەکانی بەر دەستمدا گەڕام (بانیاس)م نە دۆزیەوە .

(١١) لەوانەیە (قاسیوون) بێ‌و . نووسەر بە هەڵە چوو بێ‌و . یا (نالی) بە ئەنقەست وای نووسیبێ . لەبەر (قەیس‌و مەجنوون)ی دێری پێشوو . چونکە (قاسیون) کە لە (المنجد)دا دەڵی : «جبل مشرف علی غوطة دمشق» واتە کێوێکە بە سەر غوطەی دیمەشق‌دا دەڕوانێ . لەگەڵ (ڕەبوە - گردۆلکە)ی پێش خۆی‌و . (غوطە)ی دێری‌یەکەمی پێنج خشتەکی دواوەی دەگونجێ .

(١٢) لە تێکستەکەدا بەعەینی خەت لەسەری نووسراوە : (شووشەخ) واتە نوسخە .

(١٣) (المنجد) دەڵێ : «الغوطة : هی البساتین المحدقة بدمشق ترتوی من نهر بردی وتأتی بأطیب الاثمار . . .» .

(١٤) لە دەستنووسەکەدا لەسەری نووسراوە : (زیارەت خ) واتە نووسخە .

(١٥) دەبێ مەبەستی (زەنوبیا) نەبێ ؟ کە بە ناوبانگترین شاژنی (تەدمر) بووە . خۆ لە ئاسەواری (تەدمر) هونەری میعماری - (عیمارەت) بە ئاشکرا دیارە هەروەها (جەبهەت) نێو چەوان لە پەیکەری خاتوونێکی (تەدمر) بە جوانی دیارە . بە داخەوە وێنەی پەیکەرەکە لە (المنجد)ی چاپی (١٩) تەواو نییە بۆوەی بزانین (خلخالی) لە پێی دابووەیانا ؟ . لەوانەشە مەبەستی لە (جەبهەوو خلخالی عیمارەت) ڕووی (واجهە)ی کۆشکەکان‌و بنی کۆڵەگەکان بێ کە وەك (خلخال)ن بە هەر حاڵ من وای بۆ دەچم ئەم شیعرە لە وڵاتی غەریبی شام لە دایك بووە . ئەوەتا خۆی دەڵێ :

رازی نەبی ئەی عومری گرانمایە دەخیلم
لەم غوربەتە بمرم کە حەیاتم بە وەفاتە

(١٦) ئەم (کوا) یەشیان لە داوێنی دەستنووکە دەستکەوت . دەبێ چەند (کوا)و دێری دیمان لە دەست چووبێ ؟ .

(١٧) ناوەڕۆکی شیعرەکە باسی میعراجی پێغەمبەر (د.خ) دەکاو . لەسەرەتاو کۆتایی لێی فەوتاوە . بەڵگەی بە (نالی) زانینی ئەم شیعرە بە دوا هاتنی شیعرە بەناوبانگەکەی (هەیکەلێکم بوو چو پەیکەر . . .) و (ولە) وی نیوانیانە .

(١٨) نووسینەوەی ئەم شیعرەم بە پێویست نەزانی . چونکە شیعرەکە ئەگەر بەقەد دیوانی (نالی)ش بەناوبانگ نەبێ شتێکی وای کەمتر نی‌یە .

دەقە دەستنووسەکەی ئەم شیعرە هەر چەندە لە کۆتایی دوو دێری کەمە زۆر لە نرخی کەم نابێتەوە . چونکە دوو هەڵەکەی ئەم شیعرەی (دیوانی نالی) مان بۆ ڕاست دەکاتەوە :

١ لە لاپەڕە (٢٢٤)ی (دیوانی نالی) مامۆستا مەلا کەریم دێری یەکەم بەم جۆرە چاپکراوە :
(هەی کەرێکم بوو . چ پەیکەر ؟ طەی کەری . . .) لە شەرحەکەدا نووسراوە : «لە هەموو نوسخەکانی بەر دەستمانا نووسراوە (چ‌پەیکەر) . بەلام ئێمە لامان وایە ئەمە هەڵەی نووسیارەو ڕاستەکەی (چوپەیکەر)ە .» بەڵێ ئەم دەستنووسە شاهیدی ئەدا کە مامۆستایان نیشانەیان پێکاوە .

٢ - لە (دیوانی نالی) مامۆستا مەلا کەریم دێری دووەم بەم جۆرە نووسراوە :
بن زك‌و جەبهەت سپی . کللك ئێسترو دامەن سیا
یەککە تازو . سێبرو . . . .) .

هەر لەوێ دێری دووەمی دێری چوارەم بەم جۆرە چاپکراوە : (سم خڕو کللك ئێسترو . مەنزل بڕو . عارەق نەرێژ) . واتە وەصفەکە دووبارە بۆتەوە . دووبارەبوونەوەش لە پایەی ڕەوانبێژی شاعیر کەم دەکاتەوە . بۆیە (کللك بژ)ی دەستنووسەکە بۆ دێری یەکەمی دێری دووەم گونجاوترە لە (کللك ئێستر) .

(١٩) بەبڵاوکردنەوەی ئەم (مەسنەوی)یە بۆ یەکەمجار لە (دیوانی نالی) شیعری (مەسنەوی) دەخوێندرێتەوە . ئەم (مەسنەوی) یەش نا تەواوەو . سەرەتای دێری هەشتەمی وشەی (طەرید)ە .

جیهانی چیرۆك

# چاوی دێو . .

معتصم ساڵه‌یی

له کۆنه‌وه ترسی چاوی دێوم لێ بۆته ملۆزمێك‌و . وه‌ك ته‌وقی عه‌زازیل له گه‌ردنمدا ئالاوه . . هه‌ر له منداڵیمه‌وه ئه‌و ترسه بۆته ختووره‌یه‌ك‌و دڵ‌و ده‌روون‌و مێشكم ئازار ده‌دات . . ـه‌ونه‌یه هه‌ندێك بڵێن ڕاست ناكات‌و . هه‌ندێكیش بڵێن ـست ده‌كات . . هه‌ندێكیش بڵێن كابرا خه‌تای خۆیه‌تی‌و ـتوانێت خۆی به‌هه‌موو بارێكدا بگونجێنێت . . ! هی وایش هه‌ن – ده‌توانم بڵێم زۆریشن – هه‌روه‌ك من ئه‌و ترس‌و له‌رزه ـه ناخیاندا چه‌كه‌ره‌ی كردووه‌و . وه‌ك منیش خۆیان له‌و چاوه ترسێنه‌ره ده‌بنه‌وه . . گوایه ده‌بێت چاوی دێو چی بێت . كه ـه‌كێكی وه‌ك من گومانم له مێشكی خۆم نیه . ئا به‌م شێوه‌یه ـسی لێ ده‌كه‌مه‌وه‌و خۆمی لێ ده‌پارێزم . . ؟ ! گه‌ر بڕوا ده‌فه‌رموون ئه‌و چاوی دێوه له ئاگر به‌گڕتر‌و سووتێنه‌رتره هه‌ر كه‌سێكی تووش بێت . به‌چاو تروكاندنێك ده‌ی پروكێنێت‌و ده‌ی كات به‌خه‌ڵووز . . له ئه‌ڵماس تیژتره . گه‌ر بێت‌و هه‌ر مرۆڤێكی بكه‌وێته سه‌ر وه‌ك ئاروو دوو له‌تی ده‌كات . . له بۆنی ـبخانه پیس ترو بۆگه‌ن تره . هه‌ر كه‌سێك توخنی بكه‌وێت . ـوو به‌زوویی سه‌رو ملی ده‌شكێ‌و له هۆشی خۆی ده‌چێت . .

سه‌ره‌رای ئه‌م هه‌موو ترس‌و له‌رزه‌م هه‌میشه له منداڵیمه‌وه . گوێ ڕایه‌ڵی چیرۆك‌و ئه‌فسانه‌ی ئه‌ندێشاویم له باره‌ی چاوی دێوو درنجه‌وه . . نه‌نكه هه‌مین خوای لێ ڕازی بێت (ئه‌و له‌جێی هه‌قه‌و من له‌جێی ناهه‌ق . . !) هه‌ر وه‌ك خۆی ئه‌م ڕسته‌یه‌ی فێر كردین . ! كاتێك منداڵ بووین . له جیاتی ڕادیۆو ته‌له‌فزیۆنمان بوو . چه‌ندین حه‌كایه‌ت‌و چیرۆكی ئه‌فسووناویی بۆ ده‌گێراینه‌وه . ئێمه‌یش نقهان له خۆمان ده‌بڕی‌و . چاومان زه‌ق ده‌كرده‌وه‌و . ده‌ممان داده‌پچڕی‌و گوێ قوڵاخی گێڕانه‌وه‌ی به‌سه‌رهات‌و ڕووداوه‌كانی ده‌بووین‌و . یه‌كه به یه‌كه وشه‌كانیان هه‌ڵده‌چنیه‌وه . . ته‌نانه‌ت له شه‌وانی باراناویدا . وه‌هامان ده‌هاته پێش چاو . كه خرمه خرمی لێزمه‌ی بارانه‌كه . ده‌نگی پێی ئه‌سپی كوره پاڵه‌وانی ئه‌و ئه‌فسانانه‌یه كه‌بۆی ده‌گێراینه‌وه ! به زۆری كوره پاڵه‌وانه‌كان به‌چاو قایمی‌و نه‌ترسیه‌كه‌وه . به‌ره‌نگاری چاوی دێو ده‌بوونه‌وه . تا هه‌ره‌سیان پێ ده‌هێناو . خه‌ڵكیان له سته‌م‌و زوڵم‌و زۆریی ئه‌و چاوه پڕ ژه‌هراویانه ڕزگار ده‌كرد . . له كۆتاییشدا كوره به‌یاری شۆخ‌و شه‌نگی خۆی شاد ده‌بوو . نه‌نكه هه‌مینیش كۆتایی به چیرۆكه‌كه‌ی ده‌هێناو ده‌ی ووت : كه‌وشه‌كه‌م دڕاو هیچم پێ نه‌بڕا . . . به‌ڵام ئێمه‌ی منداڵان زۆر شتمان پێ ده‌بڕاو سه‌ر سامی ئه‌و باس‌و خوواس‌و به‌سه‌رهاته‌نه ده‌بووین‌و له ناخه‌وه ستایشی بێ پایانی نه‌نكه هه‌مینمان ده‌كرد . كاتێك نه‌نكه هه‌مین ماڵ ئاوایی ئه‌م دونیایه كرد . ئێمه‌ی منداڵ‌و گوێ گری چیرۆكه‌كانی قه‌ڵه‌می ده‌ست‌و پێمان شكا . هه‌ستێكی پڕ له‌نه‌هامه‌تی دای گرتین . ته‌مووه‌یه‌كی زۆریش هه‌ر به‌دووی نه‌نكه هه‌مینێكدا ده‌گه‌راین . كه‌له‌و جۆره بابه‌ته چیرۆكانه‌مان بۆ بگێڕێته‌وه . به‌ڵام هه‌رگیزاو هه‌رگیز ئه‌و خه‌ونه‌مان نه‌هاته دی . . ئێستا گه‌ر ته‌له‌فزیۆنی ماڵێك بشكێت ، زوو به زوویی له‌لای وه‌ستا چاكی ده‌كه‌نه‌وه . به‌ڵام نموونه‌ی نه‌نكه هه‌مین به ده‌گمه‌ن به‌چنگ ده‌كه‌وێت . .

به‌ڕێزان ، ئێستایش ئه‌و ڕۆژه‌م له‌یاده ، كه بۆ یه‌كه‌م جار وێنه‌و قه‌باره‌ی ته‌واوی چاوی دێوم به‌و دوو چاوانه‌ی خۆم

بینی . . . منداڵ بووم‌و ماڵەکەمان کەوتبووە ئەوپەڕی شارەوە . ڕیزە ماڵی گەڕەکەکەمان دەی ڕووانیە خڕی خاسە . لە نێوانی ماڵەکانماندا‌و چەمی خاسەدا ڕێگایەکی باریك‌و درێژ بەنێو باخی سەوزەکەدا درێژەی دەکێشا . من‌و منداڵانی گەڕەك کەوتبووینە سەر سەمتی دروست کردنی حەمامە قوڵێ . بەڕیزە هەر یەك لە ئاستی خۆمانەوە بەسەر ڕێگاکەوە حەمامە قوڵێیەکمان پێکەوە نابوو . لەپڕ یەکێك لەمنداڵەکان هاواری لێ هەڵساو ووتی : منداڵان بکەونە خۆتان چاوی دێو هات . . ! کاتێك ڕووانیمانە نێوەندی خاسە بینیمان تەپ‌و تۆزێك زۆر بە تیژی بەرەو ڕوومان دێت . . هەر ئەوەندەمان پێ کرا هەڵێین‌و . بەرەو سەربانی ماڵەکەمان بەپەلە بکەوینە ڕاکردن . لە سەربانەکەماندا خۆمان حەشاردا . لە ستارەی سەربانەکەوە کەوتینە دیقەت دانی چاوی دێو . . هەرکە گەیشتە سەر کۆپری‌ی جۆگا ئاوەکەی ئەم سەر ڕێگاکەی نێو باخەکە . بینیمان چاوی دێو جل‌و بەرگێکی مەیلەو سەوزی پۆشیوەو . کلاوێکی بەهەمان ڕەنگی لەسەردایە . . ئەسپێکی ڕەشی قەترانیشی لە ژێردایە . . لە ترساندا هەموو لە ئاستی خۆماندا ووشك هەڵگەڕاین . خەریك بوو خوێن لە دەمارەکانمادا بمەیەت . . چاوی دێو لەوسەری ماڵەکانەوە هەڵوێستەیەکی بۆکردو ، ئەسپەکەی لە بەردەمی ماڵی حاجی مەجید بەستەوەو ، خۆی کوتایە ماڵیانەوە .

ئێمەی منداڵ تادووای نیوەڕۆیەکی درەنگ لەسەربان پێمان نەهاویشتە خوار ەوە ، هەر بەسەرەتاتکێ ماینەوە تا ئەو کاتەی چاوی دێو گەڕەکەکانی بەجێ هێشت . . لە پاشاندا یەکسەر بەرەو حەمامە قوڵێکانمان چووین . تابەسەریان بکەینەوە . بەڵام داخی گرانم جێ سمی ئەسپەکەی چاوی دێو هەموویانی تەفرەو توناو سەرو ژێر کردبوو . . لە دووایدا بە دڵشکاویەکی زۆرەوە گەڕاینە دوواوە . گوێمان لێ بوو گوڵچینی ژنی حاجی مەجید . زۆر بە ئاسپایی‌و ترس‌و لەرزەوە بۆ ژنانی گەڕەکی دەگێڕایەوەو دەی ووت : کچینە باوانت شێوێت . چاوی دێو هەر هات‌و نەهات حاجی کەڵەشێرەکەمانی بۆ سەربڕی . سەرباری هەمووی لەحاجی تووڕە دەبووو دەی ووت : هەی بێ ئوسووڵینە . بۆ کەڵەشێرم بۆ سەر دەبڕن . . ؟ نازانن من حەزم لە گۆشتی مریشکە . ؟ ! کەی فێری ئوسووڵ دەبن . . ؟ !

بەڕێزان . واڵە ترسی چاوی دێو خۆم لە قوژبنێکدا مەڵاس داوە . . گەرچی ئێستا بەتەمەن گەورەم . بەڵام ئەو ترسەم لە گەڵ خۆمدا هەڵگرتووە . . لەگەڵ گەورە بوونمدا ئەو ترسەیش گەورە تربوو . هەرچی نووسراوو کتێب هەن دەربارەی چاوی دێو . گەر چنگم بکەون زۆر بەپەرۆشەوە دەیانخوێنمەوە . جا گەر نووسەرەکە ئاسیاوی بێت . یاخود ئەفەریکایی یاخود ئەمەریکایی لاتینی بێت . .

ئێستا ئێوە لەم ترسەی من سەرسامن‌و دەڵێن دەبێت لە کوێ خۆی مەڵاس دابێت . . ؟ ! ئایا دەبێت خۆی نەخزاندبێتە نێو سەنووقێکی ئاسنینی کلیل‌و کلۆم دراوەوە . . ! ؟ منیش لەولامدا دەڵێم نەخێر . ! بەڵکو لەنێو چووار کێوی بڵندی سەرکەشداو . لەنێو کوێرە دێیەکدا سەری خۆم کز کردووە . . ئەمەیش هەر مانای ترسنۆکی دەگەیەنێت . . ئەی گوایە بۆ ناچم بەکورەی چیرۆکەکانی نەنکە هەمین‌و . ناچم بەگژ چاوی دێودا . . ؟ یاخود بۆ ناچم بەگەردە لوولێك‌و . چاوی دێو پڕ خۆڵ‌و تۆزو چقڵ ناکەم . . ؟ !

مێردەزمەی وەرهەمی چیرۆك‌و داستان‌و ئەفسانە ئەندێشیاویەکان ، هەردەم دەستی لەبینا قاقامەو تەنگم پێ هەڵدەچنێت‌و ، هیچ دەرەتانێکم نادات‌و . هەمیشە لە گەڵمدایە . . هەروەك منداڵیم وازم لەو مەسەلەیە نەهێناوە . بەردەوام سۆراخی ئەو پیرەژن‌و پیرە پیاوانە دەکەم ، کە هەر یەکەو گەنجینەیەکن بۆ خۆیان‌و دەیان حەقایەتیان لە توورەگەی بیریاندا هەڵگرتووە . . ئەم خۆماتکردنەم لە لایەکەوە سوودی پێ گەیاندم‌و گەلێ چیرۆکی دەماو دەمم تۆمار کرد . .

ئەحە سەرقۆقزی کورە بچووکی حەمە عەلیە شەلە ، گزیرم

ەو . هەردەم ئاگاداری دەکردمەوە . . نازانم بڵێم خوا دەس
ـەعومریەوە بگرێت ، یاخودنا . . ! چونکی چەند جارێك
هەی خەڵەتاندم . . ئەو ڕۆژە کەرو بارێکی لیٚ کردم بەچاوی
دێو . ! ڕۆژێکی تریش پۆلە مەلێکی ڕووح سووکی لیٚ کردم
ـەچاوی دێوو . . وای لیٚ کردم کونە مشکم لیٚ ببێت بە
قەیسەری . . !

ئەوەتا تاریك وەختە . لەسەری سەکۆکەی نێوەندی حەوشەکەی ماڵی ئاشناکەمدا دانیشتووین . کابرای ئاشنای حەوەن ماڵ لەگەڵ مامە قوربانیدا . هەر لەگەڵ باسی مەڕو مەڵاتدا خەریکن . منیش بەبیٚ هوودە هەر گویٚ ڕایەڵی باس‌و حواستی چاوی دێوم . . . دووای حەپە حەپێکی زۆری سەگەل . . کورێك لە کورەکانی لالە هەیاس بە خۆی‌و نێرەکەیەوە خۆی کرد بەماڵداو . – هەروەك باوە – داوای لیٚ کردم دەمی گورگ ، لە گوێرەکە وێڵەکەیان کەئەو ئێوارەیە لە گەگەل دووا کەوتووە ببەستم . . ! چەقۆیەکی دەم کراوەی دابەدەستمەوە ئەوەی ڕاستی بێت منیش بە ناچاریەکەوە . دەمی چەقۆکەم نوشتانەوەو هەندێك وورتە وورتم بۆی کرد . . ! ؟ دووای سوپاسێکی زۆر کورە ماڵەکەی بەجیٚ هێشت . .

لەپڕ ئەحە سەر قۆقز خۆی کرد بە حەوشەکەداو ، بەسەرما نەڕاندی‌و ، ووتی : هۆ ! ئەوە بۆ ئاگادار نیت کەوا چاوی دێو بەچووار دەوری دێیەکەدا دەسووڕێتەوە . . ! ؟ یەکسەر کسپەیەك بە نێو دڵمدا هات‌و بە یەکجاری دەناوم بەربووەوە . . بەپەلە پووتەکانم بەچەکی لەپیٚ کردو . بەرەو دەرگای حەوشەکە تاومدا . . هەرکە چوومە دەرەوە بینیم چووار دەوری ئاوای بە چاوی دێوگەمارۆ دراوە . . چاوەکان زۆر بەزیتی لە هەموو لایەکدا دەبریسکانەوە . . ! دەستم گرت بە ئەژنۆی خۆمەوەو لەبەر خۆمەوە ووتم : ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە لیٚ‌ی دەترسام . . ! بەڵام وورەم دایە بەرخۆم‌و بەرەو ئەوسەری ماڵەکان هەنگاوم‌نا . . هەتا دەهات چاوەکان زیاتر لە ئاواییەکەوە نزیك دەبوونەوە . . وام بەبیردا هات اکەوا بەرەو رووی من دێن . . ! دەنگی خڵبە خڵبی قەرەباڵخیەك هاتە بای گوێم . . . هەرکە لە دەنگە دەنگەکە نزیك بوومەوە ، پێم لەبەردێك هەڵکەوت‌و ، ساتمەیەکم داو ، بەدەما ڕمام . . بەڵام زوو فریام کەوتن‌و هەڵیان ساندمەوە . . گوێم لەدەنگی مامەحەمەومین بوو ، لە تاریکیەکەوە پیٚ‌ی ووتم :

– ئەوە بۆ وا شپرزەیت‌و وێڵ بوویتە ؟ !

بە دەنگێکی هەڵبزرکاوی پڕ لە ترسەوە ووتم :

– چاوی دێو . . چاوی دێو . . ! ئەوەتا دێیەکەی ئابڵووقە داوە . . !

هەموو دایانە قاقای پێکەنین‌و ، لەترس‌و لەرزەکەم تیٚ‌گەیشتن‌و ، مامە حەمەو مین هێوری کردمەوەو ووتی :

– نەخێر تۆ بە هەڵەدا چوویتە . . ! ئەوە چاوی دێو نیە . بەڵکو منداڵەکانی لالە هەیاسن بەلایتەوە بەدووی گوێرەکە وێڵەکەیاندا دەگەڕێن . . !

هەرکە ئەم قسەیەم بیست ، فەرامۆشیەکم هاتەوەو ، جارێکی تریش هێزو گوڕێکم کەوتەوە بەر . . . بە شەرمەزاریەکەوە بەو شەوە تاریك‌و نتوکە بەرەو ئەو ماڵەی کەتێیدا بووم گەڕامەوە . . بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو ، کەلەرێگاکەمدا دەنگێکی زل ڕایچەڵەکاندم . . وام زانی بۆمبایەك بووو ، لە ژێر پێمدا تەقیەوە . . ! هەرکە بەئاگا هاتمەوە ، زانیم کەسەگەکەی ماڵی حاجی ناسرەو ، چاوم نەی بینیوەو بەسەریا ڕماوم‌و ، ئەویش بەحەپە حەپ نیشتۆتە کوڵکمەوە . . هەتا بۆم کرا خۆمم لیٚ‌ی دوورخستەوە سەگەکە بەزوویی وازی لیٚ هێنام . . ! لە کاتێکدا گەر ڕۆژ بووایە بەو ئاسانیە وازی لیٚ نەدەهێنام . . بەرێزان ئێوە چۆنی لێك دەدەنەوە کەیف‌و ئارەزووی خۆتانە . . بەڵام من وەهای لێك دەدەمەوە ، کە بەترسەکەمی زانی بێت‌و ، بۆیە بەو ئاسانیە وازی لیٚ هێنابێتم . . ! لەوانەیشە لە دووایدا بە ترسنۆکیەکەم گەلێك پیٚ کەنیبێت . . !

# ئەنجام...

طاهر صالح

شەوگاری شەوێکی ڕەش و تاڵ بەدرێژایی خۆی گینگڵی پێدا. ئەمدیو ئەودیوی پێکرد. داینا. ڕایکشان. دایناوە. جگەرەیەك و دوان، دەو زیاتری پێ داگیرساندو پێی کووژاندەوە.

شەوگاری شەوێکی ڕەش و تاڵ بەدرێژایی خۆی مانگ و ئەستێرەکانی بەم ڕاژەندو ئەمی بەوان ڕاژەند. بێ ئەوەی ئەنجام هیچ کامیان لەباریاندا بێت پێڵووی چاوی ئەویتریان ێك نێت !.

بەدرێژایی شەوگاری ئەو شەوە. ئەمی وروژاوی دەستی ئەو باس و خوواسە. ئەو باس و خوواسەی هەر بەگەیشتنەوەی بەرۆوی‌دا تەقیەوەو. لە ناخی‌یەوە هەڵیتەکاند. وایان لێ دەکرد گەر بۆ ساتێکیش بێت. لە (سەبری) نەگەڕێت و زوو زوو بچێتە وێزەی و مەلی خەو لەهێلانەی گەرم و گوڕی چاوەکانی هەڵفڕێنیت. بەمەش برینی سارێژ نەبووی سەبری لەهەر جارێك لەو جارانەدا بهێنێتەوە سوێ و هەر ساتە ناساتەی لەبەر دەم دادگایەکی تردا ڕایگرێت.

ئەو شەوە ژیان لای ئەم دەبووە پەڕۆیەکی شین و بەناو شانی‌دا دادەدوورا. پەڕۆیەکی ئەوتۆ شین کە کاڵبوونەوەو



شتنەوەو سڕینەوەی لە تواناو باری کەس دا نەبوو ! هەر ئەوەش وای لێدەکرد تابێت زیاتر گڕ بسێنێت و سەبری جار لەدووای جار بۆ پرسیارەکانی ڕاگرێت :

پێم بڵێ کێ ئەو ڕێ و شوێنەی نیشان دایت ؟ !.

بەهەر پرسیارێك کە کاکی لێی دەکرد. ئەو پێی دەمردو دەژیایەوە. ئەو دەیویست ڕووبەڕووی کاکی بێتەوە. پڕیاسکەی دڵی خۆی لە ئاست و ڕوویدا واڵا بکاتەوەو لە هەموو سووچ و کەلێنێکی بەسەرهاتەکەی ئاگادار کات. بەڵام ئایا شەرم و شکۆی ڕێگەی ئەوەی ئەدات ؟.

وا ئەمشەو سەبری ڕووبەڕووی گەلێك پرسیار دەکرێتەوە. هەر پرسیارەش وەرامی خۆی دەوێت !.

بێدەنگی ڕەنگە کارێکی چاك بێت. ڕەنگە ئاوێك بێت و بکرێت بەسەر پرسیارە گڕ گرتووەکان‌داو خامۆشیان کات.

بەڵام تۆش ناڵێیت بێدەنگی لەکاتو ساتێکی وادا
ئەوەندەی تر باری شانی تاوانەکە قورسو گرانتر ناکات ؟
کەوابو چاك وایە بێدەنگ نەبێتو هەموو شتێك بڵێت .
ێ ئەوەی گوێ بداتە ئەنجامو ئاکامی تاوانەکە .
بۆجارێکی‌کە کاکی پەنجەی لە رووی‌دا درێژ کردەوە :
بڵێ ، قسەبکە . دامەمێنە . پێم‌بڵێ کێ ئەو رێو شوێنەی
یشان دایت ؟ .
ئەو پرسیارە سەری‌بە سەبری داخستو لەکۆشی پێ‌نا .
کەتنەکە مچە کوڵ پێ‌ی کردم .
لەو شەوەدا تادەهات رقو قین لای کاکی خەستو
خەستر دەبووەوە . لەو شەوەدا مچە کۆڵو ئاغای لای ئەو
دەبوونە دێو درنجو بەخوێنی سەریان تینو دەبو .
بۆ باورت پێ‌کردن ! ؟ .
ئەو پرسیارە گەرانی‌یەوە دوواوە . یادگارە تاڵەکانی هێنایەوە بیرو
بۆی راگرتن .
تازە کاکی گەرابووەوە . هەر بەجلەکانی‌یەوە لی‌ی درێژ
بووبوو . چاوی لێك‌دەنا . وەك بیەوێ بەو چاو لێك‌نانە
حەوانەوەیەك بەگیانی ماندووی بدات . لەدەرگادرا ، کاکی بە
دەنگی‌یەوە چوو . کەکردی‌یەوە . ئەوەی بەرەوەیان پێی
ووت :
کاکە رەش تۆی ؟ .
کاکە رەش ووتی :
بەڵێ منم .
ئەو بەکاکە رەشی ووت :
داوات دەکەن ، زۆرت پێ‌ناچێ ! خاوە خاو مەکە .
کاکە رەش پاشەوپاش بووەوە . پێلاوەکانی لەپێ‌کردو
دەرگاکەی بەدووی خۆیدا راکێشا . ئەوانیش بەپاڵێك دایان
بەبەشی دوواوەی پیکابێکی رەنگ سەوزو ، شوفێری پیکابەکە
بە سلفێك خستی‌یە رێو ، کاکە رەشی‌دا بەدەم گێژاوی
بیرکردنەوەکانی‌یەوە .

«دەبێت منیان بۆچی بێت ؟ هیچ لە خۆمدا شك نابەم .
بڵێی بەهەڵەدا نەچووبن ؟ بۆ نابێ ؟ رووی نەداوە بێ‌گوناهێك
لە شوێنو جێگەی گوناهبارێك بەپەتدا کرابێت ؟ ! .»
بیرکردنەوەکانی رێیان پێ‌دەگرت . دەیویست لەرێگەی
ئەوانەوە بگاتە ئەنجامی تەواوی مەسەلەکە .
«ئەشێ هەبن قینیان لێم‌بێت . ئەشێتو زیاتریش . هەن
قینە لە خەڵکی دەکێشن لەهیچە . هەن شتێکی گەلێك
بچووكو بێ‌بایەخت ساڵەهای ساڵ لەدوو توێی نانێکی گەرم‌دا
بۆهەڵدەگرن . (ئاخۆ ئێستە ئەو نەگبەتە خۆی دەخات بەسەر
قاچو دەستی کێ‌دا منی بداتەوە ؟ . دەبو کە ئەو کورە ناردی‌یە
داوای هەر زوو بمدایەتێ . بەڵام تازە پاش چی ؟ ئەوەی
رۆیشت تازە ناگەرێتەوە !) تا رۆژی خۆی دێ ئەوسا وەك
کوڵەوەی باب پێتەوە دەداتو تووکی سەرت بەئاسماندا
دەبات .»

* * *

شەوگاری ئەو شەوە چوار چیوەی مێشکی ماندووی‌ئەو
بەدەیان لێکدانەوەو بیرکردنەوەی لەخۆ دەگرتو لەخۆی‌دا کۆ
دەکردەوە .
لەو شەوەدا بیری بەلای تۆڵەکردنەوەدا دەچو .
تۆڵەکردنەوەیەکی وا پڕ بەپێستی تاوانەکە بێت .
لەو شەوەدا بەبیری‌دا دەهات . لەهەموو کەلو پەلێکیان
داماڵێت . ئەویشو ئاغاشی لەژوورێکی چاڵو نسرم نێت . بەو
جۆرە بیانهێڵێنەوە . هەر ساتەو هەر تاوەو هەر رۆژەی لووتیان لە
بەردی ئەلحەدێ بدات .
بیری دەکردەوەو بەبیری‌دا دەهات . دەتوانێ کتکە
رەشەکەی ماڵی عەواشی سەرو پێچی ، لەبارێکەوە بگۆرێت
بۆ بارێکی دی . دەتوانێتو زیاتریش لە کتکێکی قورسو
لەش‌گرانو دەستە مۆوە بکات بەگیاندارێکی سرکو گورجو
پەلامار دەر .
بۆ ناتوانێت ؟ ئەی ئەوانەی بۆ سێرکەکان کار دەکەن بۆ

بتوانن پڵنگێك بەهەموو ترسناکی یەکی یەوە بگۆڕن بە گیانداریکی بەستەزمانی ئەوتۆ. کە بەچەندان سەعات بۆ بینەرن سەمە بکات؟ مەسەلەکە ڕاهێنان نی یە؟.

نێرەوە بیگرەبۆ شێرو پڵنگ‌و فیل‌و ماری کۆبراو دووا گیاندارە دڕندەو شکێنەرو ترسنەکەکانی کە.

بۆ ڕۆژێك‌و دووان‌و سیان‌و زیاتر لەگوێنی یەکی خەت سووری خات. دەمەکەی توونە توند گرێ بدات‌و بیجەرێنیێ.

لەدوای ئەو چەند ڕۆژە. دەمی گوێنی خەت سوور لە ئاستی کتکی ڕەش‌و برسی‌دا بترازێنیت. بەچاوی خۆی ببینیێ چۆن کتکی برسی یەکەم شالاو بۆناو ڕانیان دەبات‌و بەدانە تیژەکانی دایان دێنێت‌و شیتاڵیان دەکات.

بیری دەکردەوەو بەبیری‌دا دەهات لەرێگەی شێ حەسەنی مارگرەوە ڕەش مارەکەی قسنەکەی شێ محێدینی دەستکەوێت. ڕەش ماری سامناك‌و قەف ئەستوور. بەژێر دەرگای ژووری تاریك‌و نسرمدا ڕەت کات. چاوی لەسەر ڕاگریت. ببینیێ وا لەپێش‌دا دەچێت بەودیودا. ڕووەو ناوەڕاستی ژوورەکە دەکشێت‌و دەچێت. لەوێدا بۆ تاوێك دەوەستێت بەهەر چوار لای خۆی‌دا دەڕووانێت. پەیکە دەخوات‌و هەڵدەستێت‌و لەسەر قەفەکانی خۆی دادەنیشێت. دادەنیشێت‌و دەفیشکێنێت. بەوتەرحە دەمێنێتەوە. بەدووای‌دا خۆی لێ ڕادەکێشێت‌و چاو دەبڕێتە چاویان‌و دەجووڵێت. بەجووڵاندنی ئەم قەڵەمی ئەژنۆی ئەوان دەشکێت‌و دەکەونە سەر چۆك. بەدەوریان‌دا دێت‌و دەچێت. زێرە لەجێگەیەك‌و دووان‌و زیاتریان هەڵدەستێنێت. پڕ بەدانەکانی ژەهریان تێدەڕێژێت. بەوەشەوە ناوەستێ بەڕوو دووا خۆی لەملیان دەئاڵێنێت‌و لوول دەدات. کاتێ لە کۆڵیان دەبێتەوەو لێیان دەگەڕێت. چاوی هەر یەکەیان سپی بووەو دەرپۆقیوە.

تۆ چاو لەسەر ئەو دیمەنانە ڕادەگریت‌و نایگویزیتەوە. هەست دەکەیت تادێن دەئاوسێن‌و شین‌و مۆر هەڵدەگەڕێن و هەریەکەیان ئەوەندەی ڕەشکەی کایەك دەئاوسێن.

بیردەکەیتەوە. بیرکردنەوەکانت سێبەرێکی ڕەش‌ن‌و لەکۆڵ مێشکت نابنەوە.

بەبیرت‌دا دێت بەچەقۆیەکی تەنك تەنك‌و تیژ. ووردە ووردەو لەسەرخۆ پێستیان بقڵیشێنیت. بەمشت خوێی ووردو بێژراوە بکەیتە هەر قلێشێك لەو قڵیشانەوە. تێیان ڕووانیت. ببینیت چۆن خوێی ووردو بێژراوە لەسەرخۆ خۆی تێکەڵ بە خوێن‌و گۆشتیان دەکات. بەمەش تادێت ئارام‌و ئۆقرەیان لەبەر هەڵدەگرێت‌و. بەچنگ زەویان پێ هەڵدەکۆڵێت‌و هەڵدەکەنێت.

خۆر هێدی هێدی شۆر دەبووەوە. شەقامەکە لە ڕێبووارەکانی دەبڕا. سەبری هەڵتروشکابو. هەستی بە تەنیایی‌و بێ‌کەسی دەکرد. بیری لەخۆی. لەکاکی دەکردەوە. بەمەش تادەهات هیوای بەژیان کەمتر دەبو. لەو کاتەدا مچە خۆی کرد بە ماڵ‌دا. مچە دڵی دایەوەو ڕێی ماڵی برایماغای نیشان‌دا. زۆری پێ نەچوو هەنگاوەکانی بەرەو ئەوێ بردیان. دەستی لەسەر بووشی جەرەسەکەیان نا. مچە کردی‌یەوە. مچە پێشکەوت‌و ئەم بەدووای‌دا. دەرگای ژوورێکی لاکێشی لەبەر دەم‌یا خستە سەر گازی پشت. تاکێ کورسی نەرم‌و نۆڵ لە باوەشی گرت. خەڵکی گەڕەك لە برایماغایان دەگێڕایەوە دەیان ووت:

لەوەوبەر بلە لا سووتاوو ئێستا برایماغایە. خەڵکی ئەوسا بەو ناوەوەو ئێستا بەم ناوەوە دەیناسن. چەند پیاوێکی وەك مچە کۆڵی لەدەورە. هیچی لێ عاستی نابێت.

ئەوێ جێ‌هێشت. گفتەکانی برایماغای لە باخەڵ نا. مچە تا دەرگای حەوشە بەڕێی کرد. لەوێدا بەئەسپایی پێی ووت:

سبەینێ بەیانی برایماغا لەگەڵ خۆی‌دا دەتبات‌و پەلی کاکت

دەداتەوە دەست .

سەرەو خووار بووەوە . قاچی زەوی نەدەگرت . لێشاوی خۆشی‌یەکی بێ ئەندازەش تا دەهات دڵی ئاو دەدا .

سبەینێ بەیانی بۆ جارێکی دی لە دەرگایماڵی برایماغای دایەوە . دەنگێك كێشی كرد . لەتەك دەنگەكەدا ڕۆیشت . بە رمەکە گەیشت . ئەمجارەیان لووتی نەبوو بەلووتی کەسەوە . بەدەستووری دوێنێ سۆڵەکانی لێ فڕێداو لەسەرخۆ دەستی بە دەرگاکەوە نا سەری بردە ژوورەوە . چاوی گێڕا کەسی نەدی . تۆزێك وەستا . بەژوورەکەیدا هەڵڕووانی . لە هەموو شتەکانی ناو ئەو ژوورە وورد بووەوە . ڕاوەستانەکەی پیێی چوو . لەسەر ئەو کورسی‌یەی دەکەوتە شانی دەرگاکەوە دانیشت . عەباکەی سەر شانی خست .

دانیشتنەکەی خایاندی . هەستی کرد ترسێك خۆی تێدەپێچێت . خۆی بەخۆی ووت «ترسی بۆ چی‌یە . گەر ئەمیش شتێکی لەژوور سەردا بێت . مچە چۆن ڕێگەی دەدات . مچە لەوە دەرچووە بە ئێمە بێگانە بێت . هەر واشە مچە لەسەر ئێمە سەری خوی دادەنێت ! .»

دەنگێك هێنایەوە هۆش خۆی‌و لە دنیای ئەو دیوی دابڕی : .

سەبری وەرە ئەم دیو . هەر ئێستا دەڕۆین .

سەبری لەتەك دەنگەکەدا ڕاست بووەوە . عەباکەی سەر سەری خست‌و ڕووەو لای ئەو دەرگایە چو کە دەیکرد بە هۆڵەکەی ناوەوەدا . بەئەسپایی‌و لەسەرخۆ قاچەکانی بەدووی خۆیدا ڕادەکێشا . کە چوو بەو دیودا ، ئێستێکی بۆکردو لەوە زیاتر نەچووە پێشەوە . بەچووار لای خوی دا ڕووانی . هەستی بە بێ دەنگی‌یەکی تەواو کرد . سامێکی گەورەی لێ نیشت . ویستی پاشەو پاش بگەڕێتەوە . ئەوەی نەکرد . نەشی ویست وا خۆی نیشان دات ، دەیویست ترسەکان لە ناخەوە لە خۆی دا بکوژێت .

ئەو لەوەدابو کە بە خۆی زانی دەستێکی زل ، ئێجگار زل سەر دەمی نرا . خۆی ڕاپسکاند ، بێ سوود بوو ، ویستی هاوار کات و بقیژێنێت . بەو قیژاندنە گەرەکە ماڵێك بەسەر خۆی دا دا بارێنێت ، دەنگی دەرنەچوو . ئاواتی خوواست هێزو توانایەکی ئەوتۆی تێگەڕێت ، بە هۆیەوە لە چنگی ئەوان ڕزگاری بێت ، وا نەکەوتەوە .

ئەو وای دەویست ، لەلێلایی چاوەکانیشی‌یەوە ، لە ڕێگەی ئەو دڵۆپە فرمێسکانەوەی کە بەروو دوا دەچۆڕان‌و دەڕژان . برایماغای بەدی دەکرد هەنگاوەکانی بۆلای ئەمیان دەهێنا ، کە بەم گەیشت دانەوەی‌یەوەو وەك شتێکی گەلێ سووك و بێ نرخ قاچەکانی بەرز کردنەوەو لەزەوی بڕین .

ئەو ساتە ئەم خۆی وەك ئامێرێکی بێ بایەخ دەهاتە پێش چاوو ، تا دەشهات گیانی بە دەستیانەوە شلتر دەبووو ، هەناسەش لە سنگی دا دەتاساو دەخنکا .

لەو شەوەوە خەیاڵ و لێکدانەوەو بیرکردنەوەکان لای کاکە ڕەش دەبوونە بەشێك لەوو بۆ هەر لایەك دەچوو بە شوێنی‌یەوە بوون . کە ڕاست دەبووەوە پیێبە پیێی ئەو بەرز دەبوونەوە ، کە ڕادەکشا لە شانی‌یەوە درێژ دەبوون . کە دادەنیشت لە لایەوەو لە پاڵیدا پان دەبوونەوە . کە دەڕۆیشتیش قۆڵیان لە قۆڵی دەکردو . لەتەك هەموو هەنگاوێکی ئەودا هەنگاویان دەنا .

لەو شەوەوە لێکدانەوەکان دەبوونە سێبەرێکی ڕەش و تاڵ و ، بە ئامێرو کەرەسەکانی تۆڵە سەندن‌و تۆڵە کردنەوە بە پشتی سەریەوە دەوەستان‌و دەڕوان هەر جارەی ئامێرو کەرەسەیەکیان بۆ ڕادەگرت‌و ، هەر سات و وەختەی ڕێ و شوێنێکی تریان بۆ دا دەنا .

لەو شەوەدا لێکدانەوەو بیرکردنەوەکانی لە سەر ئەوە پێك دەهاتن کە لە دەمەو چێشتەنگاوێك دا ، ئەو کارەی تێدا ساز بدات . شوێن و جێگەش پشتی بۆدی لۆریە سکرابەکەی شانی ماڵی شێخە سوورە بێت . بێنێت لە ڕێگەی ئەو بۆدی‌یە شکاوەوە ، کۆلانەکەی ئەو بەر خۆی بۆ سەرنج و

تێرووانینەکانی راخات و راگرێت . چاو لە ئاستی ئەو کۆلانەداکەلا نەکات . بە چاوی خوی ببینی وا ووردە ووردە دێن . برایماغا لە پێشەوە و مچە کۆل بە دووای دا .

وا هاتن و تادێتیش نزیك دەبنەوە . زۆری پێ ناچێت دەگەنە لای . ئەوسا ئەم لێ‌یان دێتە دەست و . ئەوان بە هیچ دا ناگەن . چی فیشەك لە دەمانچەکەی دایە لە سەریاندا خالی دەکاتەوە . کاتێ ئەوێ جێ دێلێت و ملی کۆلانە هەزار لۆغانەکەی لێ دەگرێت ، ئەوان لە خوێنی خۆیان دا تل دەدەن و دەگەوزێن .

پێ هەلدەگرێت ، بە دەم پێ هەلگرتنەوە دەمانچەکەی دەخاتەوە بەر پشتێنەکەی و . لەناخی خۆی دا شتەکان هەلدەسەنگێنێت .

«قەد دەهێلم هەر ووا بەئاسانی بەسەرتانەوە برووات ؟ دەبرۆن بیخۆن ، سەرم دەهێناو سەرم دەبرد . هیچم شك نەدەبرد . هاوارم دەکرد ، کەس نەبوو گوێ بە هاوارەکانم بدا . تا بە ناوی دزی و دووکان برینەوە شەش مانگ کردمیانە ژوورەوە ئێستا دەزانم بۆ ئەوەیان لە گەل‌دا کردم . ئێستا بۆم دەردەکەوێت چی‌یان لە ژوور سەردا بوو . لەوان وابو هەروا بە ئاسانی بۆیان دەچێتە سەر . نەیان دەزانی یەك بە دە تۆلەیان لێ دەستێنمەوە .»

ئاورێك بە دووای خوی‌دا دەداتەوە . کە دل نیا دەبێ لەوەی کەسی بە دوواوە نی‌یە ، کۆتایی بە تاوو تو کردن و هەلسەنگاندنی شتەکان دێنێت و . شەقامە سەرەکی‌یەکە لە خۆی دەگرێت .

* * *

رۆژی دووایی دەمەو چێشتەنگاو ، کات و ساتی ئەنجام دانی ئەوکارەبوو . دەبوو تۆ پێشتر لە مال دەرچیت . لەو شوێن و جێگەیەداکە دەست نیشانت کردووە خۆت بنێیتەوە . نابێت کارێك بکەیت کەس پێت بزانێت . سەرانسەری کۆلانەکە لە چاوی هەلۆوە بۆ سەرنج وتێرووانینە تیژەکانت راگریت .

تۆ لەوەدابو لە مال دەرچیت و دەرگای حەشەکەتان پشت خۆت خەیت . لە زرمەیەك بە ئاگا هاتی . زرمەکە لە تۆوە زۆر دوور نەبوو . پاشەو پاش گەرایتەوە . دەمانچەکەت ساتار کرد . ئەو نەخشەیەی کە کێشابووت لە سەرەتاوە هەلوەشایەوە . بیرت لێ کردەوە . ئەنجام دانی ئەو کارە گێژی دەدایت . دەتخستە بابۆلەیەکی گەرمەوەو . بۆ چێشتەنگاوێکی کەت هەلدەگرت . . هەوالی تەقەکانی ئەو دەمەو چێشتەنگاوە دەماو دەم دەرویشت . دەووترا :

لە پشت بۆدی لۆری‌یە شکاوەکەی شانی مالی شێخە سوورەوە خۆی لێ گرتوون . زۆر داخ لە دل بووە . کە برایماغا هاتووەو مچە کۆل بە دووای داو گەیشتوونەتە ئاستی ئەو . لێ‌یان هاتووەتە دەست . چی فیشەك لە دەمانچەکەی دا بووە لە سەریان دا خالی کردووەتەوە . کاتێ ئەوێ‌ی جێ هێشتووە و ملی کۆلانە هەزار لۆغانەکەی لێ گرتووە . ئەوان لە خوێنی خۆیان دا تلاونەتەوەو گەوزاون .

هەر ئەو هەوالە وایدەگەینێ کە :

هەشت نۆ مانگێك بەر لە ئەمرۆ گیرۆدەی گرتن و بەند کردنیان کردووە . لە ئەنجامی چنینی داوێکی ووردیشەوە ژنە جووان و جەهێلەکەیان بە تەلەکەوە کردووە .

هەوالی ئەنجام دانی کارەکە گەیشتەوە بە کاکە رەش . سەرەتا خۆی خوواردەوە ، گینگلی دا . گیانی تۆلە خەریك بوو تەواو چەکەرە بکات و هەلچێت . هەستی کرد کە لە ئەنجام دانی هەرە پێویستی‌یەك دا دەست پێشکەری نەکردووە . راما . لە بن میچی ژوورەکە راما . پاشان ووردە ووردە لە بن میچەکە ترازاو بەرەو دەرەوەو هەموو دنیا پەلی هاویشت ، خاو بووەوە ، لەنگەری لێکدانەوەکانی گرتەوە . ئەمجارەیان تەواو هەستی بەوە کرد تاوانەکان یەکێکن و ئەم و ئەوانیش کە تۆلەکەیان کردووەتەوە هەر یەکێکن . خاوتر بووەوە ، دەستێکی هێور لەشە گر گرتووەکەی دامرکاند ، چاوی لێك ناو بۆ دووا جار مالاوایی لە بیرکردنەوەو لێك دانەوە کرد .



# هەزەروولا

نووسینی
نۆدار دەمبادزی

وەرگێری لە ئینگلیزیەوە
انور قرەداغی/ بەغدا

لە بیرم دێ چواردە ساڵ بووم کە بۆ یەکەم جار لە گەڵ درەختێکا دووام ، تەمەنی درەختەکە هەروەکو تەمەنی نەنکم لە شەست ساڵ تێپەڕی کردبوو . دارسێوێك‌بوو ناونرابوو ـ هەزەروولا .

هەموو زستانێك نەنکم سێوەکانی - هەزەروولا-ی بۆ ئەهێناین بۆ -تەبلیزی- بە یەکەم شەمەندەفەری بەیانیان ئەگەیشتە شارو ڕاستەوخۆ ئەهات بۆ ماڵی ئێمە ، ڕوومەتەکانی ئاڵ ئەچوونەوەو بە زەردەخەنەیەکەوە باوەشی پێدا ئەکردمو توند ئەینام بە سنگیەوە کە بۆنی لادێی تەواوی لێ دەهاتو سێوێکی ساردی بە قەدەر مەچەکێکی گەورەی ئەهاویشتە سەر جێگاکەمو ئەی ووت :

ـ (ئەوە بۆ تۆ ـ نینە[1]ـ دیاری ـهەزەروولاـ کەمانە) هەرچەندە نەنکم خۆی دەموچاوی چرچو لۆچ بووبوو بەلاّم لە خواردنی سێوی ئەو خۆشتر نەبوو بەیانیان بە سکی بەتاڵ .

- (دەی گیانەکەم بیخۆ یاخوا هەرچی غەمێك هەیە لە گەڵما بێتە قەبرەکەمەوە) . بەڕاستی سێوەکانی بەتام‌بوون .

لە دەست پێ‌کردنی جەنگی جیهاندا شارم بەجێ هێشتوو چووم بژیم لای نەنکم . ئیتر لە وێ بە تەواوی ـهەزەروولاـم ناسی . دارە سێوەکە بەرز بووبووەوە لای تەنیشت ژێرخانەکەی دەرەوەو هەرچەندە کرم‌دابوویە هەندێ شوێنی ووشك بووبووەوە بەلاّم هێشتا دارێکی بۆنخۆشی بەهێزی جوانو شاناز بەخۆبوو لقەکانی چەندەها ئەسکویو دۆلکەو قۆری گەورەو بچوکیان پیا هەڵواسرابوون . بەلاّم بە داخەوە لە نەنکم بیست کەوا وەکو جاران گەش نەئەبووەوەو بەری نە ئەگرت .

بەیانیەك لە دەست پێکردنی بەهاری ١٩٤٢دا نەنکم زۆر زوو هەڵی ساندم . کە بی‌نیم تەورێکی سافی بە دەستەوەبوو ئەتووت گوێزانە ئەوەندە تیژبوو .

ـ (نەنە ئەوە چییە ئەتەوێ من بکووژیت ؟) خۆم لە ژێر لێفەکەدا شاردەوەو بە گاڵتەوە خۆم ترساند .

– (بەس خۆت گێل بکە) بە تووڕەییەکەوە هاواری کرد بە سەرما (هەڵسە پێش ئەوەی بە گوێکانت ڕاتکێشم . هەڵسە بۆ دەرەوە بۆ ئیش) .

– (چ چەشنە ئیشێك هەیە بەم بەیانیە زووە ؟ چییت بە دەستەوەیە نەنە ؟)

(ئیشەکە باڵی پیاوی ئەوێت‌و منیش هیچم تیا بە سەر نەماوە) بە مۆنیەکەوە ووتی .

– (نە نە کوشتنی کێت بە دەستەوەیە . هی –هێتلەر یان یێرسراوی کێڵگەکەمان ؟)

– (گوێ بگرە کەرە چکولە . واز لە گاڵتە بهێنەو بە قسەم بکە) .

– (باشە نە نە وا هەڵئەستم بەڵام پێم بڵی چییە مەسەلەکە ؟) ئەمەم ووت‌و جلەکانم لەبەرکرد .

– خۆتت لێ گێل کردوە هەروەکو نەزانییت - هەزەرووڵایە – ئەو بێ‌فەڕە لەوە ناچیت هیچ حەیاو شەرمێکی هەبێت لە کەیشدا . ئا لەم گرانی‌و برسیتیەدا !) .

– (تۆ مەبەستت درەختەکەیە ؟) قیژانم بە شپرزەیەوە

– (ئائا درەختەکە ، درەختەکە)

– (دارە سێوەکە ؟) هێشتا بڕوام بە گوێی خۆم نەئەکرد

– (ئایا درەختی سێو هەیە بهێنێ پێی بووترێت دارەسێو بێ ئەوەی سێو بگریت ؟) وەڵامی پرسیارەکەمی بە پرسیارێك دایەوەو هەر خۆشی وەڵامی خۆی دایەوە :

– (نەخێر ئیتر ئەوە درەختو دارە سێو نیە . دارە بۆ ئاگر) .

– (ئەنجا باشە تۆ ئەتەوێ چی بکەم . بی‌بڕمەوە ؟)

– (نەء یەکسەر مەیبڕەرەوە . لە پێشا تۆزێك ئەی‌ترسێنین‌و گەر ئەو بێ‌فەڕە نەهاتە سەربار ئەنجا ئەی بڕینەوە . سوودی هێشتنە وەی چییە ؟) ئیتر نەنکم بۆی ڕوونکردمەوە کە چۆن بی‌ترسێنم‌وبەرەو دەرگاکە ڕۆیشت .

– (تۆ بلێیت لێم تێبگات ؟) بە زەردەخەنەوەلێم پرسی

– (گەر تۆزێك مێشکی هەبێت لێت تێ‌ئەگات)

– (ئەی تۆ نایەیت لە گەڵما ؟)

– (نەء . ئەبێ هەر خۆت بیدوێنی بە تەنها)

تا ئەو کاتە گەیشتبووە لای دەرگاکەو بە جێی‌هێشتم .

منیش تەورەکەم لە سەر شانم داناوو چوومە دەرەوەو بەرەو سەربانی ژێرخانەکە ڕویشتمو وەستامو ڕووم‌کردە –هەزدرووڵا– لقە ئاوساوەکانی خەریك‌بوون ئەقڵیشانەوە . من نازانم تۆ بڵێی بەراستی درەخت گوێی لە ئادەمیزادبێت ؟ ڕاوەستامو زەردەخەنەیەك گرتمی . ئەنجا تەورەکەم بە قایم بەرزکردەوە بۆ سەرەوەو لە هێنانە خوارەوەیا وەستانمەوە هەر تۆ زیلك بەر قەراغ بنەکەی کەوت .

– (بی‌بڕمەوە یان نەی بڕمەوە) بە دەنگێکی بەرز هاوارم کرد (بی‌بڕمەوە یان نەی‌بڕمەوە) لە پاش ماوەیەك لێکدانەوە وازم لەو بڕیارە هێناو دەستم کرد بە قسەکردن لە گەڵیاو ئەوەندە بە قایم ئەمقیڕان کە نەك هەر –هەزەرووڵا– گوێی لێم بێت بەڵکو کووپە شەرابەکەی لە حەوشەکەدا نێژرابوو – و ووتم :

– (چاوت دەربێت . ساڵێکی تریشت لێ ئەوەستم بەڵام لەبیرت نەچیت گەر میوە نەگرێت تا ئەو کاتە ئەبێت گلەیی هەر لە خۆت بکەیت . چونکە ئەوسا لە سەرو بنت ئەکەم) بە کورتی فەرمانەکەی نەنکم بەراستیو بە ووردی بردە سەر تۆبڵێی کار وەڵامی –هەزەرووڵا– چی بوویت . لەویدا وەستابوو بێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەك خۆی تێك بدات یان بجوولێتەوە . ڕەپ وەستابوو بەرامبەر تیشکو گەرمایی خۆرەکە . منیش ئەمویست پێ‌بکەنم نەك بە نەنکم ئەمجارە بەڵکو بەخۆم ، ئیتر تەورەکەم دانا لای ئەو دارانەی کە لای دارسیوەکەوە دانرابوون‌و چوومەوە ناو ئۆدەکە(٢)

– (ها چۆن بوو ؟) نەنکم لێی پرسیم .

– (بەڕاستی تۆقانم . . . نابینی بەسەزمانە هەموو گیانی ئەلەرزی ؟) ئەمەم ووتو بە گرنگیەکەوە نەنکم هاندا بەرەو –هەزەرووڵا– بڕوانێت‌و ئالەو ساتەدا دامە قاقای پێکەنین چونکە –هەزەرووڵا– لەوکاتەدا ئەلەریەوە بە هۆی ئەو بایەی لە

رۆژ هەڵاتەوە هەڵی کردبوو .

بەهار هاتو بە خێرا خۆی کشان بەسەر چیاکاناو ئەی رووانیە دارستانەکەی - گۆبازەوی‌و گەیشتە ناو کێڵگەو زەوییەکەی ئێمەش‌و بە پیتوو بەرەکەتەوە فووی بووژانەوەی کرد بە گیا سەوزەکاناو جموجۆڵی خستە ناو هەموو مەروو ماڵاتو مریشکو درەختەکانەوەو لە هەموو لایەکەوە ئەژیانەوە . دار گوێزو گێلاسەکان ئەگەشانەوە هەروەها قۆخو هەڵوژەو هەرمیکانیش خۆ -هەزەروولا- ئەتووت تازە لە خەویکی فووڵەوە چاو ئەکاتەوەو لقەکانی بلاو ئەکردەوە بێ ئەوەی کەس بزانی بەراستی بە تەمای چی‌یە .

سەر لە بەیانی‌یەك نەنکم زوو هەڵی‌ساندم‌و دیم رووی لە -هەزەوولا- بوو - (نینە -تەماشاکە) -هەزەروولا- رەپ وەستابوو لەوێدا بەهەموو گرنگی‌و شانازی‌یەکەوەو بە بەرگێکی سوری کاڵەوە لای ملیەوە کرابووەوە وەکو پیرەژنێك لەپاش ئیشی رۆژێکی گران ، بە رووی سپی‌و سەر بەرزی‌یەوە پەلی تێ ئەگرتین .

- (هاچیم پیێووتی !) نەنکم ووتی . -هەزەروولا- کەوتە بەر گرتنیکی یەکجاری زۆر ، پریش بووبوو لە شارە هەنگ ، سێوەکانی بەسەر لقەکانی‌یەوە دیاربوو زوو لە ژماردن نەئەهاتن ! هەتا بەرەو پێ‌گەیشتن برۆیشتنایە گەورەتر ئەبوون ، -هەزەروولا- ماڵی خۆمانو دراوسێکانانی پرکرد لە سێو ، بە تەری‌و بە ووشکی‌و بە کاڵی‌و بە کولاوی لیێی ئەخورا بە شێوەیەك کە بەشی هەموو ساڵەکە بکات ، گوێرەکەو مانگاکان هەر خەریکی مژینی ئەو میوەیە بوون ، لەبیرمە نزیکەی سەبەتەیەك هەموو رۆژێك سێوم ئەبرد بۆ مانگاکەی .

- (شیوفان دوشادز) - (کورە بەسە ئیتر واز لەو مانگایەم بهێنە ئەگینا بەم زووانە لەباتی ئەوەی شیرمان بداتی شەربەتی سێومان ئەداتی) - شیوفان دوشادز - پیێی ووتم - (پیم بڵێ تۆ چیت کردووە -هەزەروولا- وا توانیوتە هەموو ئاوایی‌یەکە بهروژێنی ؟) رۆژێك لە درەختەکەم پرسی لە دەست‌پێ‌کردنی زستانا لە کاتێکا بە دارێك خەریکی بووم دوا سێوی کە بەسەر لقێکی‌یەوە مابووەوە بیخەمە خوارەوە . - (گەر تۆ درەختی سێوو مێوە بیت ئەبێ هەروابێت) - هەزەروولا - بەقرتەیەکی ناو قەدە پیرەکەی وەلامی دامەوەو من هەرگیز ئەو ساڵەی پاش ئەوەم بیرناچیتەوە چونکە -هەزەروولا- ئیتر بەری نەگرت ، ترساندمو هەرەشەم لی‌کردو هان‌دا بەلام بێ سوود بوو هیچی نەگرت . ساڵی پاش ئەوە لە کاتیکا نەنکم رۆژێك شەرابی لە کوپەکە دەرئەهێنا لە پرچاوی بری‌یە ئاسمان‌و ئەنجا رووی‌کردەوە - هەزەروولا - وەکو منیش یەکێکی نەناسراو بم لە .بەردەمیا ، پیێی ووتم :

- (ئیمرۆ بەفر ئەباریت‌و هیچ دارمان نی‌یە بۆ ئاگر) دەنگیشی تورەو داغ لە دڵ بوو (پەکمان ئەکەوێت لە سەرماکەداو - هەزەروولا - ئەبێ ببرێتەوە) .

- (نەنە با ساڵێکی دیکەش لە سەری بوەستین ئەنجا ببیرینەوە) تکام لە نەنکم کرد (جارێکی تر ئەی‌ترسێنم‌و هەرەشەی لی‌ئەکەم‌و . . )

ئیتر هیچ شتێك نایترسێنێ هەر وەکو من ! ؟) .

- (نەء ، من ناتوانم بیبرمەوە) . من هاوارم کرد .

- (مەبەستت چی‌یە ناتوانی ؟) نەنکم توورە بوو (تۆ گوێت لەمن بوو یان وات زانی سەگە ئەوەرێ ؟)

- (نەخێر نەنە) هەوڵم‌دا لە سەر گفتی خۆم بم (من ناتوانم)

- (بۆچی ؟) نەنکم پرسی بەسەر سامی‌یەکەوە - (تۆ خۆت پێت نەسەلماندم کە درەخت گوێی لە هەموو شتێکە ؟) - (زۆر لە سەری مەرۆ - نینە - جارجار لەوانەیە مرۆڤێکی پیر لەخۆیەوە شتێك بڵێ ، نابێت ئەو قسەیە بە -ئینجیل - دابنرێت) ، خۆ هەندێ جار دوو کەس بەیەکەوە ئەدوێن کەچی هیچیان نازانن ئەویتریان ئەڵێ‌چی کەچی تۆش ئەوەم لێ‌نابرێتەوە کە رۆژێك ئەوەم بە دەمدا هات لە بارەی درەختێکەوە من گاڵتەم لەگەلا کردیت ئەوسا هەر بەبیریشمانە هاتووە کە تۆ باوەرت پی‌کردووم)

- (نەخێر من ناتوانم بیبڕمەوە) سوور بووم لەسەری (من لەو بڕوەدام کە درەختێك نەك هەر گوێ ی هەیە بەڵام ئەش بینێت . تەماشای بکە چۆن ڕووی کردۆتە ئەولاوە !)

- (هەی هەی وا باشترە کەڕبمو نەك گوی لەمە بگرم ، نەنکم دەستی کرد بە قیژانو هاوارکردنو ئەشی کێشا بە ڕوومەتیا وەکو بلاوێنێتەوە وابوو .

- (قسەکردن لەگەڵ تۆدا سوودی چی‌یە ، من خۆم مێشکتم تێك‌دا ئیستاش ئەبێت خۆم بتهێنمەوە هۆش خۆت . ئەی دراوسیّان وەرن بۆ ئێرەو ئەم کەرە شێتەم بۆ بەستنەوە بەزنجیرێکەوەو رزگارم بکەن لە دەستی .) دەنگی نەنکم ئەگەیشتە ناو هەموو ئاوایی‌یەکە .

- (ئەوە چی‌یە - پوورەکە لەنداز - چیت ئەوێت لەو کوڕە ؟ بۆ دوعای لیّ ئەکەی خوا بی‌باتەوە بۆ خۆی ؟) ئەمە ئەنانیا سەلووکفادز - ووتی کە بەلای ڕێگای بەینی پەرژینە قامیشەکانا بەرەو خوار ئەبووەوەو ئیتر ڕووی کردە کێڵگەکەی ئێمە .

- (بەتونو[٣] ئەنانیا - تۆ گوێم لیّ بگرە . دوو ساڵ لەمەو پێش بەم کوڕە زایەم ووت ئەو -هەزەرووﻻ - بی‌فەرە بترسێنێتو ئیستا لی‌ی ئەپاڕێمەوەو ئەمرمو ئەسووتێم کەچی نایەوێت بیبڕێتەوە . ئەزانی بۆچی ؟ ئەڵیّ درەختەکە گوێی لە هەموو شتێکەو هەموو شتێك ئەبینێت مەگەر خوا خۆی بزانێت چی چۆتە مێشکیەوە . نەنکم بەتوڕەییەکەوە ئەمەی ووتو پەرداخێکی پڕشەرابی دایە .

- (بەیانیت باش‌و خوا هەر بتهێڵێت ئەی - کەڵبەتونو[٤] دەرێجان) بەنەنکی ووت‌و شەرابەکەی خواردەوە بەشێوەیەك دەمم ئاوی‌کرد بۆی هەر وەکو من خۆم نزیکی کووپە کراوەکە نەوەستابم .

- (کەوابیّ تۆ ئەڵێیت گوێ لی‌یەو ئەبینیّ) ئەنانیا - پرسی‌و دەستێکی بەسمێڵە سووربووەکەیا هێنا .

- نەك هەر گوێی لی‌یەو ئەبینی گیانەکەم - ئەنانیا - بەڵام ئەم کەرە واچووە بەمێشکیا کە درەختەکە قسەش ئەکات)و نەنکم ڕوونی کردەوە (بەلام خەتای ئەو نی‌یە ، خەتای منە . من مێشکم پڕکرد بەو شتانە ، باشترە بچم خۆم بخنکێنم !) .

- (ئایا هیچ شەرابی خواردۆتەوە ئەم بەیانی‌یە ؟) - ئەنانیا پرسی

- (بڵێم چی‌لەوانەیە خواردبێتیەوە) نەنکم ووتی‌و لەپڕ ڕۆشنایيەك بەڕوویا هات .

- (دەباشە کەوابیّ پەرداخێکی تریشم بۆ تی‌بکە - کەلبەتونو دەرێجان -)

- ئەنانیا بە زەردەخەنەیەکەوە ووتی (ئەنجا پێت ئەڵێم چی مێشکی تێك‌داوە شەرابەکە یان تۆ) نەنکم پەرداخێکی دیکەی بۆ تی‌کردو ئەویش یەکسەر هەڵی قووڕاند .

- (وا دەرئەکەوێت بۆم کە هەر دووکتان - تۆش‌و شەرابەکەش مێشکتان تێك‌داوەو تا بتوانم بە تەواوی ڕای خۆم بدەم پێویستم بە پەرداخێکی دیکەش هەیە) . پاش ئەوەی نەنکم پەرداخێکی دیکەش بۆ تێکرد تەماشایەکی کرد ئەگەر من بوومایە لەباتی ئەو هەرگیز جەسارەتم نەئەبرد قومێکیشی لی‌بخۆمەوە بەلام - ئەنانیا -- سێهەم پەرداخی هەڵدا بیّ ئەوەی هەر خۆشی تێك‌بدات‌و ئەم جارە دوا ڕای خۆی دەربڕی .

- (ئێستا بەتەواوی دڵنیا بووم کەچی وا تێکی‌داوە) ڕووی لە شەرابەکە کرد بوو (کە وابیّ تۆ لەسەر ئەوە سووری) ڕووی کردە من ئەمجارە (کەوا درەختێك هەموو شتیّ ئەبینیّ . وانی‌یە ؟)

- (بەڵیّ من ووتم)

- (ئەی بەردێك ؟)

- (هەروەها)

- (ئەی ڕووبارێك ؟)

- (ڕووباریکیش)

ڕووی کردە ئاسمانو لە خوا پاڕایەوە کە بەزەیی پیاما بێتەوەو بەزوویی مێشکم بهێنێتەوە سەر خۆی‌و ئەنجا ڕووی‌کردەوە نەنکم

– (لای من مەسەلەکە زۆر ئاسانە   کەلبەتونو دەریجان – بابڵێین تۆ درەختێکی وەکو ئەو – هەزەرووولایە – هەر بۆ وێنە . ئەنجا گەر تۆ ببینیو ببیستی هەروەکو کورە زاکەت وورێنە ئەکات . ئایا تۆ پیاوێك نابینی . با بلێین من . گەر بێم بەرەو رووت بە تەورێکەوە بۆ برینەوەت . تێم ئەگەیت ؟ پیاوەکە ئەیەوی بت بڕیتەوە . ئەنجا تۆ ئەوە هەمووی ئەبینیو ئەشزانی بەتەمای چی‌یە . ناشتوانی یەك – ئینج – بجوولێیتەوە . وا بزانم لە بێ دەستەلاتیا ئەوەنە نابەیت شەق ئەبەیت . وانی‌یە ؟)

ئەنانیا – پرسیو پەرداخە بەتاڵەکەی بردەوە پێشەوە . بەلام ئەنکم هیچ پەلەی نەبوو وەکو بە ئارەزووی ئەو بجوولێتەوە .

– (خێراکە ژنەکە پری کەرەوە هێشتا شتە گرنگەکەم نەووتووە) ئەنکم پەرداخەکەی بۆ پرکردەوە .

– (هەر چەندە تۆ کورە شاریت) رووی‌کردەوە من (بەلام تائێستا ئەبوایە رابهاتیتایە لەگەڵ هەندێ خووەکانی ئێمەش ، سێ شت هەن لادێ‌یی لای خۆی نایان هێڵێتەوە . مانگایەك زاوزێ نەکات ، درەختێك بەرنەگریو . . . .) لێرەدا -ئەنانیا- چاوی بڕیبووە ئەنکم

– (بۆچی وا تەماشام ئەکەیت -ئەنانیا-) ئەنکم پی‌کەنیو ووتی (بڵێ شەرم مەکە ، گەر من کورێکم نەبووایە ئەم کورە زایەم لە کوێ ئەبوو ؟) .

– (ئەوە راستە کەوابێ سیهەم . . . «ئافرەتی نەزۆکە» ئەوەش بزانە ئەنکت حەوت منالی هەبوو .

– (مامە -ئەنانیا- تۆ چیت لەمن ئەوێت ؟) من پرسیم

– (بۆچی درەختەکە نابڕیتەوە ؟) ئەو لی‌ی پرسیم .

– (چونکە دڵم بۆی ئەسووتێ)

– (دڵت بۆی ئەسووتێ ؟ لاوانی تەمەنی تۆ لەوانەیە ئێستا لەبەرە خۆیان فرێ ئەدەنە سەر دەبابەی دوژمن بێ‌ئەوەی لە نارنجۆك زیاتر هیچ چەکێکی تریان پی‌بێت کەچی تۆش وا . . .)

– (لە کاتی پیویستیا مریشکێ سەرنابڕیت نەخوازە گیوێرەکەیەك) ئەنکم ووتی (ئێستا نایەوێ ئەم درەختە ببڕێتەوە چونکە دڵی ئەسووتێ بۆی ، ئەوەش نیوەی چیرۆکەکە نی‌یە شەوی سەری ساڵی دوو ساڵ لەمەو پێش بڕیار وابوو بەرازەکە سەربڕێت ، بەهەزار هەولێ ئیمساڵ گرتمانەوە لای -ئبنتابیوتی-یەوە کێردەکەش هەر بەلای ملی‌یەوە مابوو . تاکەی واز لەم شتانە ناهێنیت ؟) ئەنکم بەدڵ تەنگیەکەوە پرسی :

– (ئەو شتانەی ئەنکت ئەیڵێ راستن ؟) ئەنانیا لی‌ی پرسیم –

– (هەموویان راستن مامە -ئەنانیا- بەلام خۆت ئازار مەدە چونکە من بەهیچ شێوەیەك هەزەرووولا – نابرمەوە) من پێم ووت .

– لەبەرچی ، چونکە دڵت بۆی ئەسووتێ ؟) لی‌ی پرسیم .

– (ئەی گوایە بۆ نەء ؟ برینەوەی درەختێك شتێکی ستەمە)

– (پێت بڵێم چی ئەی شلەشاری ! پەرداخێکی دیکەم بۆ تێکە

– کەڵبەتانو دەریجان – سبەینێ پێش شەبەق‌دان درەختەکەت لارئەبێتەوە بەدەستی خۆم . ئێستا ئیشم هەیە) ئەنکم پەرداخێکی تری شەراب بۆ تێکردوو ئەویش خواردی‌یەوە .

– (کەڵبەتانو دەریجان – شتێکت نی‌یە بیکەم بەسەر شەرابەکەدا ؟)

زۆر بەشێوەیەکی ئاسایی پرسی .

– (چۆنە ئەگەر بەکرۆشتنی قامێشێکی پەرژینەکە دەست پی‌بکەیت ؟)

ئەنکم بەتوورەیی‌یەکەوە پی‌ی ووت . ئیتر ئەویش بێ ئەوەی هیچ بڵێت کێڵگەکەمانی بەجی‌هێشتو بەرێگای بەینی پەرژینە قامیشەکانا بەرەو ژوور بووەوە .

– (ئەوە چی‌یە – بەتونو ئەنانیا – ؟) ئەنکم هاواری بۆ کرد (تۆ پێش تۆزێك بەرەو خوار ئەرۆیشتیت ؟)

– (بەلی – کەڵبەتونو دەریجان – تۆزێ ئیشم لەو خوارەوە هەبوو ، بەلام گەر بچم بۆ زەوی لی‌پرسراوەکەمان بەم شێوەیە

زیانم زۆر زۆرتر ئەبێت لە سوود بۆی) دەستی بە شەرمەزارییەکەوە ئەجوولانەوە

– (کەوابێت پیاوەتیەکم لەگەلاٚ بکە – بەتونو ئەنانیا –) نەنکم پیٚی ووت (دەستبە پەرژینە قامیشەکەی – شەکرونا –دا بگرە چونکە ئەوەی من خۆی لەخۆیا تەواو نی‌یە).

– ئەنانیا- ئەرۆیشتو دەستێکیشی بە پەرژینەکەی ماڵی – شەکرونا – میکابیریدز –ەوە گرتبوو بەلاٚم لەپرێکا ئاوری‌دایەوە – (هەی کورەکە هاواری‌کرد بۆمن (تۆ ئەلێیت – هەزەروولا – کەت ئەبینیٚ ؟ دەبا بمریٚ) ئەنجا هەر وەکو لەگەڵ خۆی بیت (کە من ئێستا خۆم هیچ نابینم گوناهی – هەزەروولا – چیە !) ئەمەی ووت بە پێکەنینەوەو لارە لای ئەکرد.

هێشتا هەر من راست بووم . درەختە بیٚ رەنگە ووشکەکە هەموو شتێکی دیبوو بیستبووی‌و لەبیرکردنەوەدا بوو هەتا نیوە شەو ئەنجا لە نیوە شەوا دڵی تەقی‌بووو رەگەکانی بەرەو خۆی راکێشابووو کوپەی شەرابەکە کەلای رەگەکانی‌یەوە داپۆشرابوو کەوتبووە جموجوڵو – هەزەروولا – کە هەستی بەوە کردوەو ئەوەندەی دیکەی خۆی گرژ کردوتەوەو درزی بە قەراغی کوپەکە هیناوە بیٚئەوەی بشکێت . ئەنجا – هەزەروولا – جارێکی دیکەش رەگەکانی هەڵقرچاندبوو بەوە کوپەکە تەقیبووو ئاوێکی سوورباوی لیٚ دەرچووبوو ئاوی هەموو رەگە درێژەکانی – هەزەروولا –ی دابووو موچرکێکی تەواوی پیا هاتبوو موچورکەکەش بووبوو بە شتێکی شیرینی سەیر بۆی‌و ئەوەندە بە نائومیدی‌و تینویەتی‌یەوە شەرابە سوورەکەی خواردبوەوە بەرەگ‌و ریشەیدا چووبوو هەموو ئەو سووراییەی هەڵمژی بوو کە هەفتا ساڵ بوو لەناو رەگەکانیا شاردبوویەوەو بە نەرمی‌و گەرمی دای‌پۆشیبوو بیٚ ئەوەی پیٚی بزانێت ! ئای چۆن ئەو کوپەیەی داپۆشتیبوو ئەی‌پاراست ئەو هەموو ساڵانە ! شەرابە سوورە کە لە کووپە شکاوەکەوە فیچکەی ئەکردە دەرەوە وەکو جۆگەو – هەزەروولا – بەتوندتر هەڵی‌مژی‌و کردی بەسەر خۆیا لەشی لە چێژی پر بووبووو هەستی بەخۆشی‌و گەرماییەك ئەکردو

هەر ئەنخواردەوزە بیٚ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێت یان هەست بەتێربوون بکات . لە دوایدا تۆزیٚ خەیاڵ گرتبووی سەرخۆش بوو جیهانی زۆر بەدڵگیرترو روناکتر ئەهاتە بەرچاو.

– هەزەروولا– بەبیریا ئەهات کە هێشتا گەنج بوو ئەی ووت خەڵك چۆن ئەتوانن بژین بیٚئەوەی رەگوریشە بۆ بنی زەوی داکوتن – ئەی چۆن ئەیان توانی بجووڵێنەوە بەدەوریا ؟

ئەی چی بوو ئەبووە بە هۆی جوولانەوەیان ؟ بەلاٚم خۆی راهێنابوو لەگەڵ ئەم چەشنە شتانەداو هەرگیز بیری نە ئەکردەوە لە شتێك لیٚی تیٚنەگات یان بۆی روون نەکرێتەوە بیشی ویستایە کەس نەبوو وەلاٚمی پرسیارەکانی بداتەوە بەلام ئیمرۆ رووداوێکی گەورە رووی‌دا بوو – هەزەروولا – تا دووا دڵۆپی کووپەکەی خاڵی کردەوەو لەپر لە پەنهانی ئەو ئاوە سوورە گەیشت ، ئیتر ئێستا هیچ سەرسام نەبوو لەوەی خەڵکی دیبوو باوەشی بکەن بەیەکاو یەکتری ماچ‌بکەن‌و بگرین‌و یەکتری راونێن‌و شەر بکەن‌و پیٚبکەنن‌و گۆرانی بڵێن‌و دەستی یەکتری بگرن‌و سەمابکەن بەدەوری ئەما . هەروەها لای ئاشکرا بوو ئێستا کە بە چ شێوەو ئەرکێك کووپەکەیان ئەشت‌و ئەنجا بەم ئاوە سوورە سەرسوورماوکەرە پریان ئەکردەوە ، بەڵیٚ لە هەمووی گەیشت ئێستاو زۆر پەرۆش بووو ئەی‌ویست گۆرانی بڵێت‌و دەستبکاتە مل‌وماچ بکات‌و بگری‌و راکە راکە بکات‌و سەما بکات ، بەلاٚم.ئەو هەموو شتانەی چۆن پیٚ ئەکرێت – هەزەروولا –ی بەسەزمان خۆ ئەو هێشتا هەر درەخت بوو مرۆڤ نەبوو ، لەبەر ئەوە ئەوەی پیٚی کرا کردی خۆی لەرزانەوەو وورشە وورشی وەکو گۆرانی ووتنی کرد هەتا بەیانی هات . سەر لەبەیانی لەپر هەستی بە پیاکێشانێکی ناقۆلاٚ کرد بەلایەکیا ، بەلاٚم هەستی بەهیچ ئازارو ئێشێك نەکرد لەبەر ئەوە هیچ خۆی بەو پیاکێشانە تێك‌نەدا ئەنجا هەستی بە پیاکێشانێکی دیکە کرد لە لایەکەی ئەو لایەوە بەلاٚم هیچ گوێ‌ی نەدایە ئیتر لێدانەکان زۆربوون‌و ئەبارین بەسەریا تا نزیکەی سەعاتێك ، لە دوایدا هەستی بەقورساییەك کرد لای

چەپیەوە بۆ لای راستی ، قورستر بوو ئەنجا تەقە تەقی شکاویەکی تیژ هات لە پێشا لاربووەوە ئیتر یەکسەر بەبێ دەستەلاتی کەوتە سەر زەوییەکە تەنها ئەو ساتە گوێی لە تەقەی شکاندنی شانوو قۆڵی خۆی بوو ئێسکەکانی لە یەك ئەبوونەوە . چاوی داخستوو چووە ناو خەوێکی قوڵی خۆشەوە .

– (هەڵسە –نینە !– هەڵسە) نەنکم هەڵیساندم لە خەو (ئەنانینا ئەم بەیانی‌یە هەزەروولای بری‌یەوە) ئیتر تۆ بچۆ تەورەکە بەرە لقەکانی لێ‌بکەرەوە) ئەمەی ووتو چووەوە بۆ مووبەقەکە .

شەو بەفر باری بوو گوندەکە ئەوەندە جوان بو ئەو ووت بووکە ئەبرێت بۆ –کڵیسە – وا دیار بوو هەر کێڵگەکەی ئێمە بوو لە شیوەندابوو ، هەزەروولا –ی گەورەی لق شکاوو بریندار بەلادا کەوتبوو وەکو لاشەی مردوو لەسەر سەربانی ژێر خانەکە منیش چوومە سەربانەکەو پیش ئەوەی دەست‌بکەم بەپارچە پارچە کردنی لقەکانی بەمەلوولیەکەوە لەسەر یەکێکیان دانیشتم‌و سەیرێکی – هەزەروولا–م کرد یەکسەر لە شوێنی خۆم سڕ بووم بینیم لە ڕەگەکانی درەختە بێ دەستەلاتەکەوە شتێکی سوور ئەهاتە دەرێ ئەت ووت خوێنە .

– (نەنە نەنە) هاوارم کرد

– (چیت ئەوێت ؟) لیێی پرسیم

– (چی بووە ؟)

– (وەرە ئێرەو خۆت ببینە)

– (ئەوە چییە ؟) نەنکم حەپەسابوو .

– (لەوانەیە خوێنی درختەکە بێت) من ووتم بە دەنگێکی شیرزەوە .

– (چۆن ئەبێت ، ئێستا مانگی یەکەو درەخت هەموو سست بوون‌و تا مانگی دوو ئاوو گیان سەرناکەویت) نەنکم ووتی‌و ئەنجا پەنجەیەکی خستە ناو شتە سوورەکەوەو بۆنی کردوو بەمەترسی‌یەکەوە تەماشایەکی کردم .

– (سەری کووپەکە لابە) فەرمانی پی‌کردم ، منیش راستەوخۆ بەردەکەی سەر کویەکەم لابردو نەنکم تەماشای ملە پانەکەی کرد . کووپەکە خاڵی‌بوو ! .

– (ئەی گەورەی مەزن ، دایکی ئادەمیزاد ، ئاوینەی راستی – ڤیرجن مەیری[٥] – گیان بەزەییت بێتەوە پیامانا . ئێمەی گووناهباری هەژارو لێمان مەگرە !) نەنکم ئەپاڕایەوە لە ئاسمان بە دەنگێکی پڕ کلۆڵی‌و مەلوولی‌یەوە ، دەستی بەرزکردبووەو تۆزە تۆزە ئەژنۆکانی دائەنەواند بۆ خوارەوە .

– هەزەروولا –ش لە سەرماکەدا چاوەکانی کردەوە ، لەو شێوە هەڵگەڕاوەیەیدا جیهان وەکو سەربەرەو خوار بووبێتەوە وابوو سەرسام بوو ، لە پێشا هەموو گلەییەکی رووداوەکانی خستە سەر شتە سەیرە سوورەکە ، بەلام ئەنجا کوڕەغەمگینەکەی دی لەسەری دانیشتووەو تەورەکەشی لە ناو دەستیایەو تۆزی لەولا تریشەوە ئافرەتێکی ڕەش پۆش دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردۆتەوەو وئەژنۆکانیشی لەسەر بەفرە ساردەکەن ، هەموو ئەو شتانەی بینی‌و تی‌گەیشت کەوا خۆی – هەزەروولا – مردووە ، ئیتر چاوەکانی نووقاندەوە ، ئەم جارەیان بە یەکجاری . .

**پەراوێزەکان :**

ئەم چیرۆکە لە گۆڤاری (لوتس)ی کۆمەڵی نوسەرانی ئەفریقاو ئاسیوی وەرگیراوە .

LOTUS: (Journal of Afro – Asian Writers)
( – Association) –
No . 53 – 1983 PP 22–30

نۆدار دەمبازی :

لە ساڵی ١٩٢٨ لە تەبلیسی / یەکێتی سۆڤیانی - لەدایك بوە . پەخشان نوس‌و چیرۆك نوسێکی ناسراوە . چەند خەلاتێکی دراوەتێ بۆ نوسینەکانی . یەکەم چیرۆکی کورتی کە ناوی کوڕە لادێ‌یەکەیە - لە ساڵی ١٩٥٨دا بلاوکراوەتەوە .

١ – نینە نازناوە بۆ منالێ لە بەشی رۆژ ئاوای جۆرجیا

٢ ئودە – چەشنە خانویەکی جۆرجیایە لەسەر کۆڵەکەو پایە دروست‌دەکرێت .

٣ – بەتونو – نیشانەی ڕێزگرتن کاتی قسەکردن لەگەڵ پیاوا وەکو ووشەی (کاکە)ی خۆمان .

٤ کەلبەتونو – نیشانەی ڕێزگرتنە کاتی قسەکردن لەگەڵ ئافرەتدا وەکو ووشەی (خان ، خانم)ی لای خۆمان .

٥ – مەبەست لە (مریەمە) دایکی حەزرەتی عیسا .

# سرووشت لە دیمەنەکانی هونەرمەندی مەزنی ئینگلیزی «کۆنستێبل»دا

نووسینی : مێژوونووسی سۆڤیەتی : «کووزنیچۆڤا»
وەرگێڕانو ئامادەکردنی لە ڕووسی‌وە : «محمد عارف»

هونەرمەندی ئینگلیزی بلیمەت (جۆن کۆنستێبل) بە باوکی هونەرمەندە نیگارکێشەکانی هونەری : درووست کردنی «دیمەنی سروشتی واتە LANDS – CAPE» دەژمێردرێ .

هونەرمەند لە بەشی یەکەمی سەدەی نۆزدەمین‌دا ژیاوە ، لەو کاتەی کە تێگەیشتن‌و دەربڕینی دیمەنی سرووشتی بەدەست کاریو شێواندنێکی زۆرەوە باوبووە . (کۆنستێبل) جوانیو دەوڵەمەندیو پەیوەندی ڕاستەقینەی سرووشت لەگەڵ مرۆڤدا ، دۆزیوەتەوەو لە نیگارە بەنرخەکانیدا بەرجەستەی کردوون . هونەرمەند سرووشتی بە مامۆستاو کانی نەمری سروشتی داناوەو ئەوەندە لە دڵو دەروونەوە دیمەنەکانی درووست کردوون ، تا پلەی ئەوەی زۆر لە هونەرمەندانی (باربیزۆن)[1] و ئیمپریسیانستەکان واتە (انطباعی)یەکان تێیەڕیوە . (کۆنستێبل) لە کاتێکی ناخۆش‌و پڕ لە ئاژاوە ژیاوە . . . . کاتی شۆڕشی فەرەنسیو هێرشەکانی ناپلیونو شۆڕشی پیشەسازیو جوولانەوەی کرێکارەکان . هونەرمەند لە ١١ی حوزەیرانی ساڵی ١٧٧٦دا لە مێرنشینی (سافۆلك) لە ڕۆژهەڵاتی ئینگلتەرە لە دایك بووە . هەرێمی باسکراو بەشێکە لە جوانترین هەرێمەکانی وولاتو پڕ لە دارستانو گۆمو ڕووبارو شینایی‌یە .

باوکی هونەرمەند پیاوێکی دەوڵەمەندی خاوەن چەند ئاشێك بوو لەسەر ڕووباری (ستوور) . جوانیو ڕەنگینیو هێمنی ئەو سرووشتە هەرە ڕەنگینە کارێکی قوولی لە زەوقو بینینی ئیستاتیکی هونەرمەند کردووە . لە سەرەتادا باوکی هونەرمەند دژی ئەوە وەستاوە کە ببێتە نیگارکێش‌و ویستوویەتی ببێتە پارێزەر یاخود قەشە ، بەڵام لە ئەنجامدا پاش کۆشش و ناخۆشی‌یەکی زۆر ئارەزووی هونەرمەند هاتوەتە دیو پاش



ماوەیەك لە ئەكادیمیەی هونەرە جوانەكانی پادشاهی لەندەن وەرگیراوە .

هونەری دیمەنی سرووشتی ، هەر لە ناوەراستی سەدەی هەژدەمینەوە ، لە ئینگلتەرە ، بەتایبەتی لە بەكار هێنانی رەنگی ئاوی : (WATER – COLOUR) و رەنگی رونی : (Oil – COLOUR) پایەكی تایبەتی بەرزی وەرگرتووە لێرەدا بەشێوەیەكی تایبەتی ناوی هونەرمەندانی مەزن : (كۆزینس ، تۆماس گێرتین‌و تێرنەر) دەهێنین . (كۆنستێبل) لە ساڵی ١٨٠٢وە بەرهەمەكانی لە پیشانگا ئەكادیمی‌یەكان پیشان داوە ، بەلام لە سەرەتادا نەیتوانیوە سەرنجی بینەرو رەخنەگرەكان بۆ بەرهەمەكانی رابكێشێ ، ئەو كاتە (تێرنەر)ی نیگاركێش شۆرە سواری مەیدانی ئەم جۆرە هونەرە بووە . لە بەرهەمە هەرە نایابەكانی هونەرمەند لەم قۆناغەدا ناوی نیگاری : (دۆلی دیدهێم) دەهێنین . هونەرمەند لەم دیمەنەدا ئازایانە هەموو (كێشە هونەری‌یەكانی چارەسەر كردووەو لە بەكار هێنانی رەنگدا زۆر شتی تازەی دۆزیوەتەوە) . ئەوەی شایانی باسە لەو كاتەدا بەكار هێنانی رەنگی زێرین‌و قاوەیی باو بووەو مۆركێكی رەشبینی‌و دوور لە بوون‌و رەنگە گەشەكانی سرووشت بووە ، هونەرمەند ئازایانە پالێتی رەنگی گۆریوەو رەنگی گەش‌و كراوەو پڕ لە تیشكی رۆژو سیبەری (ساردو مەیلەو سارد)ی بەكار هێناوە . كۆنستێبل بیری فەلسەفی خۆی بەم جۆرە دەربریوە : «چ كاتێك بە قوولی لەشت بگەین . تەنیا ئەو كاتە بەچاكی دەیبینین» . بناغەی دامەزراندنی هونەریی : (COMPOSITION) هونەرمەند لە دیمەنە سرووشتی‌یەكانیدا ، لە سەرچاوەو سەنتەرێكی ناوەراستەوە هەڵدەقوڵێ‌و هەموو دەوروبەری ئەم سەنتەرەش یارمەتی دروست كردن‌و تەواو بوونی یەكێتی دامەزراندنی هونەریی دەدەن . . . تەنانەت هونەرمەند لە سكێچە ئامادەیی‌یەكانیشی ئەم رێرەوەی بەكار هێناوەو هێزی تەوژماوی (یەكەم سەیركردن)ی تێدا بەرجەستە كردووە . . ئەو هێزە تەوژماوی‌یە



(پیرۆزەی) کە بەداخاوە لە بەشێك لە دیمەنەکانیدا ، کە لەسەرەخۆو بەپێی قۆناغ درووست کراون ، سارد بووەتەوە .

دیمەنی : (عارەبانەی‌کا) بەلووتکەیەکی بەرزی دیمەنی سرووشتی دەژمێردرێ . لە کاتی پیشان دانی لە پیشانگای (ئەکادیمی) سەرنجی کەسی رانەکێشاوە . سەیر ئەوەیە ئەم دیمەنەو کۆمەڵە نیگارێکی تری هونەرمەند کە بۆ یەکەم جار لە فەرەنسا پیشان دران ، بە شۆرشێکی هونەری ژماردراون‌و هونەرمەندێکی بلیمەتی وەك : (دێلاکروا) کە بەباوکی هونەری رۆمانتیکی دەژمێردرێ زۆر کاری تێکردووەو لەو کاتەدا خەریکی درووست کردنی نیگاری بەناوبانگی : (کووشتاری خیوسی) بووەو لە ئەنجامی ئەو کارتی‌کردنەدا هەموو پەیوەندی رەنگەکانی نیگارەکەی گۆڕیوەو سوودێکی زۆری لە (کۆنستێبل) وەرگرتووە .

هونەرمەند لە دوا قۆناغەکانی ژیانیدا بایەخی زیاتر بە دەربڕینی ئاسمان : لە کاتی سایەقەو هەورو باران‌و گۆڕینی کات‌و وەرز داوەو هەڵوێستی خۆی بەم جۆرە روون کردووەتەوە : «ئەگەر هاتو ئاسمان بناغەو ئەندازەو --کلیلی- دیمەن نەبێ ، زەحمەتە هونەرمەند ناوێك بۆ بەرهەمەکەی بدۆزێتەوە ، چونکە ئاسمان کانی رۆناکی سرووشتەو هەموو شتێکی لە باوەش خۆی گرتووە .»

لە بەرهەمە هەرە نایابەکانی هونەرمەند ناوی ئەو دیمەنە سرووشتیانە دەهێنین : (پردی واترلۆ ، کلیسەی سالسبیری ، ئەسپێك لە کاتی پازداندا ، پەیکەرێك بەیادگاری رینۆڵدس‌و کۆشکی هێدلی) .

هونەرمەندی مەزن تا دوا رۆژانی ژیانی خەریکی بەرهەمی تازە بووەو لە هەمان کاتیشدا بووەتە مامۆستای هونەرە جوانەکان‌و ئەو نووسین‌و لێکۆڵینەوانەی دەربارەی هونەری (دیمەنی سرووشتی) کە لەلایەن ئەوەوە نووسراوە ، تاکو ئێستاش پایەو نرخی بەرزی تیۆری خۆی پارێزگاری کردووە . بەداخەوە هونەرمەند تەنیا پاش کۆچی دوایی بەنیو سەدە ، نرخی پێدراوەو پایەو ئاستی خۆی وەرگرتووە . لەو کاتەی ژاوە رەخنەگرەکانی ئینگلتەرە بە (کەم‌و کوری خەیاڵ‌و فانتازیا) تاوانباریان کردووە ، بەڵام لە هەمان کاتداو لە ماوەی ژیانیدا هونەرمەندە فەرەنسی‌یەکان – بەتایبەتی هونەرمەندانی باربیزون‌و ئیمپریسیانستەکان -- بەمامۆستاو رابەری خۆیان ژمارەدووە .

هونەرمەند لە شەوی ٣١ی ساڵی ١٨٣٧دا کۆچی دوایی کردووە . پاش ئەوەی بناغەیەکی زێرینی بۆ هونەری (دیمەنی سرووشتی) درووست کردووە .

(١) – قوتابخانەیەکی هونەری فەرەنسی بوو زۆربەی دیمەنەکانیان دەربارەی سرووشت بووە .

# پۆل گۆگان

**Paul Gauguin**

**(١٨٤٨-١٩٠٣)** (*)

**نووسینی : ئەلبێرتۆ مادتینی**
**وەرگێرانی بە دەستکاری‌یەوە لە ئیتالی‌یەوە**
**«یاسینی فەقێ سەعی»**

هونەرمەندی فەرەنسی «پۆل گۆگان – Paul Gauguin» لە ٧ی حوزەیرانی ١٨٤٨ لە پاریس هاتۆتە ژیانەوە ، لە تەمەنی (٣) سالّی‌دا لە لایەن دایك‌و باوکی‌یەوە براوەتە – پێرو Peru – بۆ ناوچەی – لیمە Lima – بۆ لای کەس‌وکارەکانی دایکی کە یەکێك‌بووە لە نەوەکانی سەرۆکی ئەو ناوچەیە ، باوکی گۆگان رۆژنامەنووسێکی سیاسی چەپرەو بووە ، لە ماوەی ئەو سەفەرە دوورو درێژەدا کۆچی دوایی کردووە ، دایکە بێوەژنەکەی گۆگان ، پاش ئەم مردنە کتوپرە ، بە هەزار دەردی سەری توانیویەتی خۆی‌و دوو منالّەکەی بگەیەنێتە – لیمە – ، بۆ ماوەی «٤» سالّی رەبەق لەوێ ماونەتەوە ، لە سالّی ١٨٥٢دا گەراونەتەوە بۆ فەرەنسا . .

(گۆگان)ی لاو لە (ئۆرلێانس Orleans) خوێندنە عادەتی‌یەکان تەواو دەکات‌و لە سالّی ١٨٦٥دا لە یەکێك لە پاپۆرە بارهەلّگرەکاندا دەست دەکات بە ئیش‌کردن‌و هەر بەم پیشەی دەریاوانی‌یە لە بەهاری ١٨٧١ دا خزمەتی سەربازی کۆتایی پێ دەهێنێ .

لە هاوینی ١٨٧١دا پاش ئەوەی واز لە دەریاوانی دێنێ ، لە ئاژانسی پارە گۆرینەوەی – بێرتین Bertin – دەست بە ئیش دەکات‌و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دەست پاکی‌و دلّسۆزی خۆی پیشان دەدات‌و بەم بۆنەیەوە دەکرێت بە لێپرساوی یاری‌یەکانی -- بۆرسە Borsa[1] – .

لە سالّی ١٨٧٣دا «مێتی سۆفیا گاد – Mette Sophie Gad» کچە منالّکارێکی شۆخ‌و شەنگی دانیمارکی‌بوو ، کردی بە خێزانی خۆی‌و ئیدی ژیانی تادەهات تێرەوتر بەرەو پەیمانو بەلّێنە بۆرژوایی‌یەکان دەچووە پێش ، بوو بە باوکی منالاّن‌و خاوەنی پارەیەکی زۆر ، بەم توانا ئابوری‌یە کەوتە کرین‌و کۆکردنەوەی تابلۆ نوێ‌یەکانی ئەو سەردەمە ، ئەمەش تەنیا حەزێك‌بوو کە لە «داروزە Da Rosa»ی ئامۆژگاری‌کەری‌یەوە



بۆی مابووەوە . (دارۆزە) یەکێك‌بوو لەوانەی زۆربەی زۆری بەرهەمەکانی – پیساررۆ Pissarro –ی هونەرمەندی کۆکردبووەوە . .

گۆگان لە کاتی بێ‌ئیشی‌دا بە هاوکاری – ئێمیل Schuffenecker –ی هاوڕێی خۆی بە وێنەکێشانەوە خەریك دەکرد ، بەو هیوایەی تابلۆی هونەری‌وا وێنە بکێشێ کەجێی ڕەزامەندی خۆی‌بێت . لە ساڵی ١٨٧٦دا گەیشتە ئەو بڕوایەی یەکێك لە تابلۆکانی خۆی لە هۆڵەکەیدا هەڵبواسێ . لە ساڵی ١٨٨٠ بەدواوە ئەم خولیای وێنەکێشانەی پەرە دەسێنێو بەشداری سەرتاپای پێشانگاکانی گرووپە (انتباعی -- Impressionst)[٢] ەکان دەکات . گۆگان لە نێوانی کارکردنە ئاسایی‌یەکەو هونەری وێنەکێشاندا ڕادەمێنێ . تووشی دودڵی‌یەکی گەلێ گەورە دەبێت لە هەڵبژاردنا . بەلاّم بڕوای تەواوی بەوەبوو کە دەبێت یەکێکیان هەڵبژێرێو هەموو توانای خۆی بۆ تەرخان‌کاتو هەتا مردن ژیانی لەگەڵدا بە سەربەرێ . . هێشتا کەکەس نەیدەزانی کامەیان هەڵدەبژێرێ .

لە ساڵی ١٨٨٣دا بەبێ ئەوەی ژنەکەی ئاگادار بکاتەوە ، بڕیاری وازهێنان دەدات لە ئیش‌کردنو (ئاژانسی – Bertin) بەجێ دێڵێو وەك شەیدایەکی هونەری وێنەکێشان دێتە پێشەوەو تابلۆو ڕەنگەکان لە ئامێز دەگرێتو ژیانی بۆ تەرخان دەکات . .

گۆگان بە شێوەیەك ئەم هونەرەی هەڵبژارد دەت‌ووت ڕاستەڕێی گەیشتن بە ئاسودەیی‌و شادمانی مرۆڤی دۆزیوەتەوە ، وای دەبینی کە ئەم تولەڕێیە (واتە هونەری وێنەکێشان) دەی‌گەیەنێتە خۆر ، بۆیە بە هیچ شێوەیەك گوێی نەدا بەوەی ئەم هەڵبژاردنو بڕیارە چەند دەکەوێت لە سەر خۆی‌و کەس‌و کارەکەی – پێش هەموو شتێ لە سەر ژنو ماڵو منداڵەکانی – چونکە لە فەرەنسای ئەو سەردەمەدا وازهێنان لە کارکردنی نێو ئاژانسێکی پارە گۆڕینەوە وە خۆخەریك‌کردن بە هونەری وێنە کێشانەوە . بڕیارێکی سەیرو جێی ڕەخنەی خەڵکی‌بووە . . چونکە هونەرمەندان لە هەژاری‌و برسێتی‌دا ژیاونو فەرمانبەرێکی وەك ئەویش دەرگای بەختو دارایی‌یەکی باشی لە ڕوودا کرابوەوە . . بە هەرحاڵ ، خێزانەکەی لە (کۆپن‌هاگن) بەجێ دێڵێو ڕوو دەکاتە پاریس ، بەلاّم هێندە نابات دەگەڕێتەوە بۆ لایان . لەو ماوە کەمەدا لە پاریس تووشی چەندین تەنگو چەڵەمە دێت وەك : زاڵ‌بوونی بەرهەمە بازرگانی‌یەکان بە سەر بەرهەمە هونەری‌یەکاندا . هەژاری‌و نەبوونی‌و دەست کورتی‌یەکی زۆر کەوایان لە گۆگان کردبوو لە پێناوی پاروی ژیانی‌دا پڕوپاگەندە بە سەر دیوارەکاندا

هەڵبواسیٚ . ئەمانە سەرەڕای دەبەنگی جەماوەری پاریس کە پێکەنینیان بە کارەکانی دەهات و گاڵتەیان پیٚ دەکرد . هەروەها تووشی نەخۆشییەکی سەخت بوو کە یەکسەر خۆی لە نەخۆشخانە دۆزیەوە . . ئەم هەموو خەم و ئازارو ئێشە زۆر بێشەرمانە زەق لە بەرامبەری پاکی و بێگەردی دڵ و دەروونی ئەودا ڕاوەستابوون . لەم ماوەیەدا بۆی ڕوون بووەوە ، کە سەرچاوەی خراپەکارییەکان وەك حەقیقەتێك بە شێوەیەکی گشتی لە هاوڕێیەتییەوە تووشی دەبن . بۆیە چیدی پیٚی نەکرا لە پاریسدا بمێنێتەوە . بەلاٚم دەبیٚ ئەوە باش بزانین گەرچی ژیانە تایبەتی و تاکە کەسییەکەی هونەرمەند سێبەری ئەو دێوەزمەو چەپۆکی ئەو مەرگە ساتانەی پیٚگەیشتیٚ بەلاٚم هونەرەکەی هەر پاك و بێغەش و زۆر ڕاستگۆیانە پاراستووەو تامردنیش ڕێگەی نەداوە پەنجەی کارەساتەکان ڕووی پاکی هونەرەکەی پیس بکات . .

هەتا ساڵی ١٨٨٥ لە ARouen (ڕوان) و (کۆپن هاگن) دەبیٚ و ئیتر بەرەو پاریس دەگەڕێتەوە . دەست دەکات بە هاتووچۆی نێوان – پاریس – و –ئینگلتەرە – ئەمەش لەبەر ئەوەی حەزی بە بینینی دیمەنی گوندەکانی ئینگلتەرە دەکردو لەوێش ژیانێکی ئاسودە دەژیا بە پارەیەکی کەم . لەم ماوەیەدا «چارلێس لاڤال – Laval» دەبینیٚ و هاوڕێیەتییەکی پتەوی لەگەڵا دەبەستیٚ . گۆگان بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا بڕیاری هەلاٚتن لە شارستانییەت دەدات بەهاریکاری ئەم (لاڤاڵ)ە . لە نیسانی ١٨٨٧دا بە جووتە بەرەو (پاناما – Panama) دەکەونە ڕیٚ و لەوێوە دەچن بۆ (مارتینیکا – Martinica –)و لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا بە نەخۆشی و لاوازی و لات و پووتی بە دوو قوٚڵی دەگەڕێنەوە باوەشی شارستانییەت – پاریس – Schuffenecker –ی هاوڕێی گۆگان لە پاریس باوەشی بۆ دەکاتەوەو ماوەیەك لەلای خۆی گلی دەداتەوە ، بەم بۆنەیەوە دەتوانیٚ (ڤان کوخ -- Van Gogh) و (تیۆ – Teo) بناسیٚ و پەیوەندیان لە گەڵدا ببەستیٚ . چونکە ئەمانە هەردوکیان (گۆگان)یان خۆش دەویست و حەزیان بە بینینی دەکرد . جگە لەوەی بە کارەکانی سەرمەست دەبوون و شێوازو ڕەنگ و هونەرەکەی گۆگان کارێکی زۆری تیٚکردبوون .

لە ساڵی ١٨٨٨دا ، گۆگان بەشداری پێشانگایەکی کرد کە لە لایەن (ڤان کوخ – و – تیۆ) وە سازکرابوو ، بەلاٚم هیچ جۆرە دەستکەوتنێکی دارایی بۆ ئەو تێدا نەبوو . هەمدیسان خەمباری و نائومێدی یەکی زۆری تووش هات ، چونکە بەو نیازەوە گەڕابووەوە (Pont – Aven) (پۆنت – ئاڤان) کە تیایدا جێگیربێت . . بۆ بەرەنگاری ژیان و دەوروبەرەکەی ، گۆگان پاش ئەم نائومێدییە ، دەستی بە کارکردنێکی بێوچان لە بواری وێنەکێشان و پەیکەر تاشین و سیرامیكدا ، بە گروپیٚ لە هونەرمەندان دەورەدرابوو لەوانە :

(Scrusier – de Haan – Laval – Bernard)

دوابەدوای ئەمە لە Arles (ئارل) هۆڵێك تەواو دەکات لە گەڵ (ڤان کوخ)دا ، لەمەشدا سەرکەوتنی تەواو بەدەست ناهێنیٚ ، تەواو بێزار دەبێت و ڕوو دەکاتە ئینگلتەرە ، لەوێش بەشداری پێشانگای ساڵانەی ساڵی ١٨٨٩ دەکات ، کە لەلایەن (Cafe Volpini)[٣] یەوە ڕێکخرابوو . لێرەش تووشی بەدبەختی و نائومێدی دێت ، بەلاٚم ئەمجارەیان تەنها لەڕووی داراییەوە ، دەنا بەرهەمەکانی گۆگان جیٚی بایەخ و سەرنجی هونەرمەندە لاوەکان و ڕەخنە گرەکان دەبێت ، ئەمەش ئەو سەرکەوتنە نزیك دەکاتەوە کە بەحسرەتەوە چاوەڕوانی دەکرد . سات و سەردەمی سەرهەڵدان و دەرکەوتنی هونەرمەندێتی گۆگان هێندە نەماوە لە بەرچاوی هەمووان دا ببێتە حەقیقەت .

لە کۆتایی ساڵی ١٨٩٠دا لە پاریس وەك عنصرێکی گرنگ و هونەرمەندێکی ناسراو لە سەرتاپای کۆڕو کۆبوونەوەکانی گروپە ، سیمبۆلیستەکان»[٤] دا بەشداری دەکات ، کە بە شێوەیەکی گشتی لە (Cafe Voltaire)[٣] ڕێکدەخرا . .

لەم بوارەدا توانی پەیوەندییەکی توند لە گەڵ ئەمانەدا



بەستێ : (Mallarme – Aurier – Redon – Morise – Carriere) – هەروەها ناوبراوان بە : (Mirbeau) – و – (Nabis) . هەمان Mallerme) مالارمێ) لە ڕۆژی ٢٣ی مارتی ١٨٩١دا (بانکێتۆیەك)[٥] لەسەر شەرەفی خۆی بۆ گۆگان دادەنیێو هەر خۆشی سەرپەرشتی دەكات . ئەمە لە كاتێكا هونەرمەند بڕیاری تەواوی خۆی دابوو بە وازهێنان لە فەرەنساو هەنگاونان بەرەو ناوچە ئیستیوائی‌یەكان بۆ گێڕانی چەند تاقی‌كردنەوەو ڕووبەڕوو بوونەوەیەك لە گەڵ سروشتو دیاردەكانو ژیان لەو ناوچانەدا . دەگاتە دورگەی Tahiti) تاهی‌تی)و یەكەمین ئیشی هونەری دەست‌پی‌دەكات لە مەمەرێكا بەڵام هیچ دڵخۆش‌نەبوو ، چونكە نەیدەتوانی كەمتر لەو ئاوو هەواو شوێنە سروشتیو سەربەستی‌یەدا كار بكات ، چونكە هێندە ناوچەكەی بە دەوڵەمەندو هەست بزوێن بینیوە حەزی نەدەكرد هەقی تەواوی خۆیانی پی‌نەدا و كەمتر لەوان وێنەبكێشێ . . سەر لە نوێ گەڕایەوە پاریسو لە ئابی ١٨٩٣ هەتا شوباتی ١٨٩٥ لەوێ مایەوە . . ئەمجارەش جگە لە بێهیوابوون و خەمخواردن هیچی دیكەی لەو ژیانە دەست نەكەوت : لە لایەكەوە ئەو پێشانگایەی لە (Duran – Ruel) كردیەوە لەلایەن جەماوەرەوە بە باشی پێشوازی نەكرا ، لەلایەكی دیكەشەوە فرۆشتنی تابلۆكان بە گۆترە كارەساتێكی جەرگ‌بڕبوو ، سەردان لە ژنەكەی كە لە (كۆپن هاگن) دەژیا هیچی لە مەسەلەی بارو زروفی ژیانی گۆگان نەگۆڕی . . ئەمە سەرەڕای ئەوەی پارەو سەرمایەی میراتی مامەكەی لەسەر لەپی دەستی وەك فووی لێ بكرێت ئاوا خێرایی خەرج دەبوو ، لەولاشەوە (Annah)[٦]ی هاوڕێو خوشەویستی وازی لێ دەهێنێو ستودیۆی ئیش‌كردنەكەشی لێ داگیردەكات . . ئیتر گۆگان بە تەواوی بێزاردەبێتو بڕیاری بنەبڕی خۆی دەدا . بە وازهێنان لە فەرەنسا بۆ یەكجارەكی ، لە سەرەتای ساڵی ١٨٩٥دا بەرەو (تاهی‌تی Tahiti) دەكەوێتە ڕێ . .

گۆگان هەر لە سەرەتای ژیانی‌یەوە لە (تاهی‌تی) خۆی فێری تەنیایی دەكاتو واز لە ژنەكەشی دێنێو سەرتاپای پەیوەستەكانی نێوان خۆیو ژیانی دەوروپشتو كۆمەڵ دەپچڕێنێ ، تەنیا پەیوەستێك كە هەواڵی گۆگانی بە خەڵكی ڕادەگەیاند Daniel) de Monfreid)ی هاوڕێی دەبێت . . گۆگان لە معاناتێكی چڕوپڕی «شەڕ»و «خراپە»دا دەژیا ، لە ناو گەردەلوولی چەندین پرسیاری تراژیدی بێ وەڵامدا . دەخولایەوە ، لە خۆی دەپرسی : ئێمە چین؟ لە كوێوە هاتووین ؟ بۆ كوێ دەچین ؟ . . و هتد . بەم شێوەیە خودی خۆی بە تاڵ دەكردەوە لە سەرجەمی هیواو ئاواتو حەزو ئارەزووەكانی ، هەتا گەیشتە ئەو بڕوایەی كە خۆی بكوژێ . لە ساڵی ١٨٩٨دا یەكەمین هەوڵی بۆدا بەڵام وادیاربوو مەرگ هێشتا ناوێرێ لە قەرەی زیندوێتی ئەو بدات – پاش ماوەیەك ووزە دێتەوە گیانیو دەست دەكات بە كاركردنێكی زۆرو بەردەوام . . لە ژێر باری هەژارییو نەبوونی‌یەكی گەلێ ئەستووردا دەژیا . . تا دەهات زیاتر هەوڵو تەقەلای درێژە پی‌دەدا هەتا لەگەڵ لێپرسراوانی دورگەكەدا دەكەوێتە ناخۆشیو ڕقەبەرایەتی‌یەوە ئەوان هەرگیز بە چاوێكی باشەوە سەیری ئەم پێست سپی‌یەی ناو خۆیان نا كەنو نەكردووە ، چونكە گۆگان بە بەردەوامی لە ناویاندا دەژیاو هەمیشەش پەیوەندی لە گەڵ هەژارانو داماوانی ئەو دورگەیەدا پتەو بووە . . لە بەر ئەم ڕقەبەرایەتی‌یە زۆری بۆ دیو (تاهی‌تی) بەجێ دێڵێو لە ترسی هەڕەشەی خاوەن كارەكان ڕوو

دەکاتە (Dominique) .

لە ساڵی ۱۹۰۱دا نەخۆشی‌یەکی سەختی تووش دەبێ‌و بۆ تەنیا یەك چرکە بیر لە گەڕانەوە دەکاتەوە بۆ فەرەنسا ، بەڵام (De Monfreid)ی هاوڕێ‌ی هەرزوو ئەوەی دەخاتەوە یادکە چارە نووسی ئەو تازە دەبێ هەر لێرەبێ‌و بۆی نی‌یە بگەڕێتەوە . . لێ‌پرسراوان‌و خاوەن کارەکان‌و دەوڵەمەندەکانی ئەو ناوچەیە ، ئامادەبوونی ئەم پێست سپی‌یە کە هەمیشە پارێزگاری لە ماف چەوساوەکان دەکات‌و دژ بە بەرژەوەندی ئەوان دەوەستێ بە کارێکی ترسناکی دەبینن‌و بەم بۆنەیەوە لە مارتی ۱۹۰۳دا بۆ ماوەی (۳) مانگ لە بەندیخانەی توند دەکەن .

گۆگانی هونەرمەند لە گێژاوی ئەم خەم‌و ئێش‌و ئازارەدا ، نەخۆشی‌یەکەی تادێت پەرە دەسێنێ ، هەستی‌کرد لەم ژیانە پڕ لە هەوڵ‌و هەنگاوو بڕیارو جوڵەیەدا هیچی بۆ نەماوەتەوە لەوە زیاتر کە گوێ شل بکات بۆ ووشە پیرۆزو پڕ لە مرۆڤایەتی‌یەکانی کابرا شوانە پیرە پرۆتستانتی‌یەکەی هاوڕێ‌ی کە ناوی (Vernier) بووە .

لە ۸ی مایسی ۱۹۰۳دا ، گۆگانی هونەرمەند لە نزیك هەناسەو ووشەکانی شوانەی پیرەوە ، هێدی هێدی سەرپەنجاکانی بۆ دواماڵئاوایی دەبزوێنێ‌و بۆ هەتا هەتایی چاوەکانی لە بەردەم مرۆڤ‌و سروشت‌دا لێك دەنێ . . تەنیا کەسێ کە هاواری مەرگی بە جیهاندا بانگەوازکرد ئەو شوانە پیرەبوو کە زۆر ڕاستگۆیانە بە دەم فرمێسکی ویژدانەوە دەیقیژاند : پێست سپی‌یەکە مرد . . ئەم هاواری مەرگە زۆر بە ئاسانی لە ناو داوە جاڵجاڵۆکەی ئەو هەمەجی‌یەتە پڕوپوچ‌و بە تاڵەدا تا دەهات لە گوێ وون دەبوو تا وای لێ‌هات نەدەبیسرا . .

پێست سپی‌یەکە مرد

. . . . سپی‌یەکە مرد

. . . . . . . مرد .



چەند نموونەیەك لە تابلۆکانی :

**۱ - لەوەرگا**

«ساڵی ۱۸۸٥ - ٦۳ × ۷۹سم» لە گالێری‌یەی هونەری هاوچەرخ لە شاری میلانۆی ئیتالیا پارێزراوە ، ئەم تابلۆیە دەگەڕێتەوە بۆ (Grassi) تابلۆکۆکەرەوە .

گۆگان لە سەرتاپای بەرهەمەکانی سەردەمی لاوێتی‌دا چەند شێوازو شێوە دەربڕینێکی لەیەکچوو هەست پی‌دەکرێ . کە بوونەتە مۆرکی بەرهەمەکانی ئەم قۆناغەی هونەرمەند . . ئەوانەش هەر وەك (فینیۆن Feneon) دیاری‌کردوون ئەمانەن :

A– چڕی لە هێڵەکاندا ، کە پێکەوە گونجاوی‌یەکی ئاسایی‌و جوانیان هەیە .

B– درەختی باڵابەرزو چڕ ، ڕووەو ئاسمان هەڵچوون‌و لە سنووری تابلۆکان چوونەتە دەرەوە .

C– زەوی تێراوو بە پیت ، کە ئەو درەختانەی لە سەر ڕواون .

D– ئەمانە گشتی لە سروشتێکی شێداری پڕ لە ژیان‌دا کۆ کردۆتەوە

**۲ - عیسای زەرد**

«ساڵی ۱۸۸۹ - ۹۲×۷۳سم» لە شاری» بوفالۆ Buffalo» لە گالێری‌یەی (Albright)ی هونەری پارێزراوە . . گۆگان لە ساڵی ۱۸۸۸دا بانگەوازی شێوە دەربرینە تایبەتی‌یەکەی خۆی

دەكات بەوەی دەبێ هونەرێكی» سەرەتایی‌یانەی سادەو بێ دەسكاری بەرزو پرمانا» ببێنێتە كایەوە . هەر ئەمەش بووە مەبەستی سەرەكی‌و مەشخەڵی هەوڵ‌و تاقی‌كردنەوەكانی هونەرمەند . ئەم تابلۆیە یەكێكە لەو هەوڵ‌و تاقی‌كردنەوانە ، گۆگان لە زنجیرەی ئەو بەرهەمانەیدا ، هەروەك ئەم نموونەیەی لەبەرچاوماندایە ڕەنگە سادەو نەگۆڕو بە شەوقەكانی بەكارهێناوە . .

ئەم عیسایەی كە لێرەدا وێنەی كێشراوە ، لەو پەیكەرەی كەنیسەی «ترێمالۆ – Tremalo»ی وەرگرتووە كە لە ناوەڕاستی چەندین سەرچاوەی ڕووناكی بەخش‌دا دانراوە . .

**٣ – Autoportret – وێنەی هونەرمەند خۆی –**

(ساڵی ١٨٩٦ – ٤٠×٣٥سم) لە شاری (Beziers) لەلای (Mme L . Huc)ی نەوەی (De Monfreid)ی هاوڕێی گۆگان ، ئەم تابلۆیە پارێزراوە .

گۆگان ئەم وێنەیەی لە «تاهی‌تی Tahiti» كردووەو ناردویەتی بۆ هاوڕێی بەوەفاو خۆشەویستی خۆی Daniel) (de Montreid ، ئەو هاوڕێیەی كە لە دواساڵەكانی ژیانی هونەرمەندا بووە تاكە پەیوەستێكی نێوان گۆگان‌و جیهان .

ئەم شاكارەی هونەرمەند یەكێكە لە تابلۆ هەرە سادەو سەربەستەكانی ، چ وەك جەوهەرو چ وەك دەربڕین‌و وێنەكێشان ، سەربەست لە هەموو جۆرە خۆ بەستنەوەیەك بەبنەماو دەستوورە باوەكانی وێنە كێشان‌و ڕەنگەكان لەو سەردەمەدا ، تەنانەت سەربەست لە دەستووره سیمبۆلی‌یەكانیش . . سێبەری ئەندێشەو خەم‌و بێزاری‌یەكی ئەستووری ئەو ساڵە تراژیدی‌یەی كە بەسەری بردووە لە سیمایدا دەبینرێت . لێرەدا گۆگان خۆی بە ڕاپەڕیوێكی هەلاتووی ناشادمان زانیووەو هەروەها سیمای خۆی بۆ نەخشاندووین .

**٤ – كچە منداڵكارە تاهی‌تی‌یەكان‌و گوڵی مانگۆ . .**

(ساڵی ١٨٨٩ – ٩٤×٧٣سم) لە شاری (New York) لە مۆزەخانەی «مێترۆپۆلیتان» ، دانراوە ، ئەم تابلۆیە دەگەڕێتەوە بۆ (W. C. Osborn)ی تابلۆ كۆكەرەوە . . ئەم شێوەی نەخشاندن‌و پێشكەش‌كردنە ، لەلای گۆگان ، خاڵی بەیەك گەیشتنی نێوان حەقیقەتی سروشتی‌و ماناو مەبەستە سیمبۆلی‌یەكانە .

بیرو بۆچوونی ئەو دو كچە منداڵكارە ، بیركردنەوەو جیهان بینی پاك‌و بێ‌گەردی سەرەتایی‌یانەی مرۆڤە بەرامبەر ژیان‌و زیندوویتی . . سەرەتایی‌یەكی پڕ لە دڵنیایی‌و ڕاستگۆیی ، هەر ئەمانەشە كە بوونەتە هۆی خۆشحاڵی دەروون‌و ناخی گۆگان . .

**پەراوێز :–**

(١) یاری‌یەكانی «بۆرسە Borsa» مەبەست لەو ئاڵوگۆڕەیە كە دەكرێت لە شێوە پارەیەكەوە بۆ شێوەیەكی دیكە ، یان لە بانقەكاندا . وەیان هەروەك دامەزراوێكی سەربەخۆ خەریكی جێبەجێ‌كردنی ئیش‌و كارەكانی ئەو ئاڵوگۆڕە دەبن .

(٢) الانطباعیة Impressionismo – ئیمپرێسیۆنیزم بزووتنەوەیەكی تەشكیلی‌یە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا لە فەرەنسا سەری هەڵداو نزیكەی زیاد لە (٢٠) ساڵی خایاندووە . بە پێی ئەم بزووتنەوەیە ، گرنگی‌و ئەركی هونەرمەند ئەوەیە كە ئینتیباعاتی بینین‌و بیروكردنەوەی خۆی پێش‌كەش بە جەماوەر بكات نەك وێنەگرتنی واقیعە بابەتی‌یەكە . ئەم بزووتنەوەیە ڕەنگی‌داوەتەوە بۆ بواری ئەدەب‌و مۆسیقاش . .

(٣) – Cafe Voltaire) و (Cafe Volpini) مەبەست لە دوو قاوەخانەیە كە هونەرمەندان تیایی‌دا كۆبونەتەوەو كردوویانە بە مەڵبەندی سەرجەم گفتوگۆو چاوپێ كەوتنیان .

(٤) الرمزیة – Simpolismo سیمبۆلیزم – بزووتنەوەیەكی هونەری‌و ئەدەبی بووە لە فەرەنسا لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا وەك شۆڕشێ لەم دوو بوارەدا سەری هەڵداوە – مەبەستی سەرەكی ئەوەبووە كە جیهانی حەق حەقیقی بە چەند ڕەمزێك (یەعنی چەند Simbolo یەك) تەعبیر لێ بكات .

(٥) (Banchetto) – بانكێتۆ جۆرە پێشانگایەك دەگەنێ كە لە شوێنە گشتی‌یەكاندا بكرێتەوە (لە گۆڕەپانێكدا) یان (لە سەر شەقامێك) كە چەند ستاندێك یان مێزێك دابنرێ‌و بەرهەمەكانی لە سەر چەسپ بكرێت . . (لەم شێوەی پێشانگا كردنەوەیە لەلای ئێمە نی‌یە منیش وام بەباش زانی ئەم ووشە ئیتالی‌یەی بۆ دابنێم – وەرگێڕ)

(٦) Annah – ئاننە) ئافرەتێكە خەڵكی (giavo) ، هاوڕێ‌و خۆشەویستی گۆگان بووە .

لێ‌بینی :

( 1 maestri del colore – No 16)

٭ – ئەم بەرهەمە بە زمانی ئیتالی لە ژمارە «١٦»ی (زنجیرەی مامۆستایانی ڕەنگ)ەوە وەرگێڕاوە . كە لە میلانۆ لە لایەن دەزگای چاپ‌و بڵاوكردنەوەی «فراتێللی فابری»یەوە لە ساڵی ١٩٦٣دا یەكەمین جار چاپكراوەو لە ساڵی (٧٦–١٩٧٧) دا بۆ دووەم جار چاپكراوەتەوە ، كە بە پێنووسی «ئەلبێرتۆ مارتینی» ژیان‌و ووتارێك لەسەر گۆگان نوسراوەتەوە . منیش كردوومە بە كوردی‌و ئەوەندەی توانیبێتم بە دەسكاری خۆمەوە لە هەندێ لایەنی‌دا درێژەم پێداوە .و پەراوێزم بۆ نووسیوەتەوە . .

# تیۆرەکانی مۆسیقا

- صلاح رؤوف -

**پێشەکی :-**

گەر چاوێك بەمێژوی مۆسیقای جیهانیدا بخشێنین هەندێ شتمان بۆ روون ئەبێتەوەو چەند پرسیارێکیشمان دێتە پێشێ ، کە هەر یەکێك لە ئێمە ئەتوانین وەلامی هەندێکیان بدەینەوەو هەندێکیان بێ وەلام سەرنگون ئەبن .

لەو پرسیارانەش . ئایا میللەتانی جیهان چۆن گەیشتونەتە ئەو رادەی پێشکەوتنە لە مۆسیقاو گۆرانیدا ؟

ئایا ئەوان بەتایبەت بۆ مۆسیقا دروست بوون ؟

بۆچی هەموو میللەتێك مۆرکی رەسەنایەتی مۆسیقاو گۆرانی خۆی بەتەواوی ئەزانێ ؟ .

ئایا هەر ئەوان توانای دروست کردنی بلیمەتی وەکو مۆزارتو بتهوفنو . .. . هتد . یان هەیە ؟ .

ئەی چۆن ئەو هەموو زاناو بلیمەتە مۆسیقاییانە پەیدابوون ؟ .

ئەی چۆن هەرچی زانیارییەکی مۆسیقا هەیە بەهەموو بەشەکانیەوە لای ئەوان پەرەی پێ دراوەو گەیشتۆتە ئەو رادەی کە ئیستا ئەی بینین ؟

بۆ وەلامدانەوەی ئەو پرسیارانەش ئەبێ پیشەکی ئەوە بزانین کە هەرگیز پێشکەوتنو پەرەپێدان بەدەست نایە گەر تەنیا هەوڵی ئەوە بدەین کە ئاستی هونەری خۆمان فراوان بکەینو کارە هونەریەکانمان زیاتر زانیاری مۆسیقای تیدابێ . لەبەر ئەوەی دەورو پشتەکەمان تەنها بەو سادەییەی خۆی ئەمێنێتەوەو تەنها دەست خۆش کەریان لەدەست دێت . بۆ ؟ چونکە هونەرمەندەکان خەریکی پتەوکردنی ناوەرۆکی مۆسیقاو گورانیەکانیەتیو بەزانستیە نوێکان پاراو ئەکاو گوێ گریش ئەڵی بەخوا خۆشە ! . یان ناخۆشە ! . هەموو ئەرکی کارە مۆسیقاییەکە تەنها بەو دوو وشەیە کۆتایی دێت .

گەر مەبەستی هونەرمەند گوێ گرتنی میللەتەکەی بێت لە کارە هونەرییەکەی . ئەوا گوێ گرتن لە مۆسیقا مانای چێژ لێ وەرگرتنە .

چێژ لێ دەرگرتن بەواتای نرخ دان بەو کارە .

جا گەر من لە ناوەرۆکی ئەو کارە نەزانمو هیچ زانیارییەکم بەرامبەری نەبێ . تەنانەت زمانی نوسینو خوێندنەوەکەشی نەزانم کەواتە من ناتوانم نرخی بۆ دابنێم .

هەر کاتێ توانیم نرخی بۆ دابنێمو لە نهێنیەکانی بکۆڵمەوە ، ئەوا چێژم لێ وەرگرت ، کە چێژم لێ وەرگرت ، ئەتوانم

لەسەری بدوێمو لای چاکو خراپی بلێم بۆ ئەوەی هونەرمەندەکەش کەڵك لە لا چاکەکانی وەربگرێتو لا خراپەکانی لابەرێت . بەو جۆرە پەرە پێ‌دانو پێشکەوتن دێتە ئاراوە . ئەو پرسیارانەش هەندێکیان وەڵام ئەدرێنەوە .

جا بۆیە بەئەرکی سەرشانی هەموو هونەرمەندێکی ئەزانم کە ئاستی رۆشنبیری هونەری میللەتەکەی لە ئەستویەتی ، گەر بۆی کرا .

تا ئەو روشن بیریە ببێتە هۆی سودبەخشیو زیاتر بەرەوپێش چوون . منیش لیرەدا لە سەرەتایەك لە ئەلفو بای زمانی مۆسیقاتان پێشکەش ئەکەم گەر کەمیش بێت هیوادارم سود بەخش بێتو ببێتە هۆی فراوان کردنی ئاستی روشنبیری‌مان .

**١) – مۆسیقا . .**

گەر سەرنج بدەینە مێژووی سەر هەڵدانی مۆسیقا ، ئەبینین هونەرێکی کۆنەو هەر لە سەرەتای دروست بوونی مرۆڤەوە بەگویچکەی ئاشنابووە . ووشەی مۆسیقا وەکو زانا مۆسیقایی‌یەکان ئەڵێن وشەیەکی یۆنانی‌یە . بەمانای سەرتاپای هونەرە جوانەکان هاتوە . بەڵام لە دواییدا ، بەزمانی سازو ئاواز وتراوە .

**٢) – مۆسیقا چی‌یە . . . ؟**

مۆسیقا هونەرەو زانستەو زمانە . بەشێکە لە بەشەکانی هونەرە جوانەکان . وەکو هونەری وێنەکێشانو بەشەکانی تری (الفنون التشکیلیة) . یا وەکو هونەری شانۆییو هونەری بینا سازی (الفن المعماری) .

ئەم بەشانەی هونەر بەگشتی کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر هونەری مۆسیقا . هەر وەکو چۆن مۆسیقا کاری کردۆتە سەر ئەم بەشانەی تری هونەر .

مۆسیقا وەکو بەشەکانی تری هونەر پێویستی بە بەهرەیەکی سروشتی هەیە بویە دەڵێن مۆسیقا هونەرە .

مۆسیقا زانستە ، لەسەر بناغەیەکی زانستی بیرکاریو فیزیاییو سروشتی دانراوە .

مۆسیقا زمانێکی جیهانی‌یەو ئەلفو بای تایبەت بەخۆی هەیە وەکو هەموو زمانەکانی تر ئەنوسریو ئەخوێنرێتەوە .

مۆسیقا بزوێنەری هەستی مرۆڤەو کار ئەکاتە سەر بیری ، بۆیە دەڵێن مۆسیقا زمانێکی جیهانی‌یە ، چونکە لە سەرتاپای جیهاندا تەنهایەك نوسینو خویندنەوەی هەیەو بەیەك شێوە دەرئەبرێ هەر چەندە بەپێی سروشتو بارەکانی ئەو کۆمەڵەی تیا ئەژی تایبەتیەکانی ئەو کۆمەڵە دەرئەبرێ . بویە هەر وەکو دیارو ئاشکرایە ، هەر نەتەوەو خاوەن مۆسیقایەکی تایبەتی خۆیەتیو بەپێی پێشکەوتنی ئەو نەتەوەیە مۆسیقاکەشی گەشەدار ترو پێشکەوتو ترە .

هەروەها نۆتەی مۆسیقا ئەلفو بای زمانی مۆسیقایە وەکو چۆن هەموو زمانێك ئەلفو بای تایبەت بەخۆی هەیە .

**٣ – دەنگ :–**

دیاردەیەکی سروشتی‌یەو بەهۆی لەرینەوەی تەنێکەوە روو ئەدات . لە کاتێکدا هەوا ئەو لەرینەوانە ئەگەیەنی بە پەردەی گوێ . بەهۆی دەزولە عەسەبیەکانەوە ئەروا بۆ دەماغو هەست بەو دەنگانە ئەکەین . بەڵام ئایا ئەو هەموو دەنگانەی کە گوێمان لی‌ی ئەبێ هەمووی هەر دەنگی مۆسیقایی‌یە . . . ؟ نەخێر ! ئەبێ ئەوە بزانین کە دوو جۆر دەنگ هەیە .

١ – دەنگی نامۆسیقایی . واتا غەڵبە غەلب یان ژاوە ژاو . کە ئەو دەنگانەن خاوەنی پلەی دەنگی نین لەرینەوەکانی رێكو پێك نین . وەکو دەنگی هەورە گرمەو ، قیژاندنو . . . . هتد .

٢ – دەنگی مۆسیقایی . بریتیە لەو لەرینەوە رێكو پێکانەی کە لە سانیەیەکدا روو ئەداتو لە پلەیەکی گەرمایی دیاری کراودا .

هەموو دەنگێکی مۆسیقای لەلایەن مرۆڤەو هەمو ئامێریکی مۆسیقاوە لاسایی ئەکرێتەوە .

کە ئەڵێین لەرینەوەی رێكو پێك مەبەست لەو دەنگانەیە کە خاوەنی پلەیەکی دەنگی (بەرز یا نزم) تیژ یا گڕبێت .

هەروەها خاوەنی ماوەو کاتی دیاری کراوی خۆیەتی . ئەو مەوداو کاتەی کە دەنگە مۆسیقاییەکان پێیان ئەچێت (ئەی خایەنن) لە کاتی ژەنیندا کار ناکاتە سەر گۆرانی خەواسی سروشتی دەنگە مۆسیقاییەکان .

وەکو ووتمان هەموو دەنگێك خاوەنی چەند ژمارەیەك لەرینەوەی تایبەتی خۆیەتی (کە بەهۆی جولانەوەی تەنێکەوە روو ئەدات) زۆربونی یا کەم بوونی ئەو لەرینەوانە ئەبێتە هۆی بەرزبونەوەی (تیژی) یا نزم بونەوەی (گڕی) دەنگە مۆسیقاییەکە . (گۆرانی لە پلەیەکی مۆسیقاوە بۆ پلەیەکی دەنگی تر) .

هەروەها باریکیو ئەستوریو کورتیو درێژی ئەو تەنە کە ئەلەرێتەوە تیژیو گڕی دەنگەکە دەست نیشان ئەکا . بۆنمونە گەر تەنەکە باریكو کورت بوو ئەوا دەنگەکە تیژ ئەبێ (زیل ئەبێ) بەلام گەر درێژو ئەستور بوو ئەوا دەنگەکە گڕ ئەبێ .

ژمارەی لەرینەوەی ئەو دەنگانەی کە ئەبیسترێن لە (١٦) لەرینەوە لە سانیەیەکدا گویچکەی مرۆڤ هەستی پێ دەکا (لە گڕترین دەنگەوە) بەلام گەر ژمارەی ئەم لەرینەوانە کەم تربون ئەوا گویچکەی مرۆڤ هەستی پێ ناکاو پێیان ئەوترێ لەرینەوەکانی ژێر دەنگە بیستراوەکان (الموجات التحت الصوتية) . هەروەها بەرزترین (تیژترین) لەرینەوەش کە گویچکەی مرۆڤ هەستی پێ بکا نزیکەی (٢٠٫٠٠٠) لەرینەوەیە لە سانیەیەکدا . هەر لەرینەوەیەکیش لەو ژمارەیە پتر بوو نابیسترێو پێی ئەوترێ لەرینەوەکانی سەروی دەنگە بیستراوەکان (الموجات الفوق الصوتية) .

لە نیوان ئەو دو پلە لەرینەوانەدا (١٦–٢٠٫٠٠٠) کە ئەبیسترێن بەشێکی زۆر لە دەنگ ئەبیسترێ ، بەلام هەموویان دەنگی مۆسیقای نین چونکە گویچکەی مرۆڤ تەنها ئەو دەنگانە لەیەك جیا ئەکاتەوە کە لەرینەوەکانیان لە نیوان (٤٠–٤٠٠٠) لەرینەوەن لە سانییەیەکدا .

ئەو دەنگە مۆسیقاییانەش لە نیوان حەوت دەنگی سەرەکیدا جێی دەبێتەوەو لە چەند پەیژەیەکی دەنگیدا ئەبیسترێن .

**٤) – دەنگ پێوەر (المعيار الصوتي) (Diybazowon)**

زانا مۆیقاییەکان بۆ ئاسانی پیوانی (دەست نیشان کردنی) هەموو دەنگە مۆسیقاییەکان هەلسان بەدەست نیشان کردنی دەنگێکی مۆسیقاییو لەرینەوەکەیان بەتەواوی پیوا . بۆ ئەوەی ببێتە پیوانەی دەنگە مۆسیقاییەکانی دی . بۆیە لە سالی ١٨٨٥ز بەتێکراپی لە کۆنگرەیەکی جیهانیدا دەست نیشانی دەنگی (لا) (A) کراو دەنگ پیوەرەکەیان لەسەر ئەوە دروستکرد . ئەو دەنگەش دەکەویتە پەیژەی ناوەراستەوە (السلم الاوسط) دەست نیشان کرا کە (٤٣٥ ل س) هەیە . بەلام لە کۆنگرەیەکی تر لە ئەوروپا سالی ١٩٤١ز زانا مۆسیقاییەکان پلەی لەرینەوەی ئەو دەنگەیان زیاتر کرد بۆ (٤٤٠ ل س) . ئەو دەنگەش وەکوو وتمان دەنگی (لا)یەو . دەنگی لای سەر هەموو ئامێرە مۆسیقاییەکان بەو دەنگ پیوەرە دەست نیشان ئەکرێو پێشی ئەوترێ (الشوكة الرنانة) .

ئەوا لەسەر ئەو دەنگ پیوەرە هەموو دەنگەکانی پەیژەی ڕەنگاو ڕەنگ لە پەیژەی ناوەراست دەست نیشان ئەکەین .

| پلە دەنگیەکان | ژمارەی لەرینەوە لە چرکەیەکدا | بە نزیکەیی |
|---|---|---|
| دۆ ، do | ٢٦١٫٦٣ | ٢٦٢ |
| دۆ = ڕیٚ b | ٢٧٧٫١٨ | ٢٧٧ |
| ڕیٚ ، Re | ٢٩٣٫٦٧ | ٢٩٤ |
| ڕیٚ = می b | ٣١١٫١٣ | ٣١١ |
| می ، Mi | ٣٢٩٫٦٣ | ٣٣٠ |
| فا ، Fa | ٣٤٩٫٢٣ | ٣٤٩ |
| فا = سول b | ٣٦٩٫٩٩ | ٣٧٠ |
| سۆل ، Sol | ٣٩٢٫– | ٣٩٢ |
| سۆلٚ = لا b | ٤١٥٫٣١ | ٤١٥ |
| لا ، La | ٤٤٠ | ٤٤٠ |

| | | |
|---|---|---|
| لا = س b | ٤٦٦٫١٦ | ٤٦٦ |
| سی ، si | ٤٩٣٫٨٨ | ٤٩٤ |
| دۆ ، do | ٥٢٣٫٧٥ | ٥٢٤ |

**٥ – سیفەتەکانی دەنگی مۆسیقا :**

هەموو دیاردەیەك لە جیهاندا خاوەنی سیفاتی تایبەتی خویەتی بۆیە دەنگی مۆسیقاش خاوەنی چەند سیفەتێکە کە تایبەتن بەخویەوە . زیلی (تیژی) دەنگ بەپیێ پانتایی ئەو تەنەی کە لەرینەوەکە دروست ئەکا لە سانیەیەکدا ئەگۆرێ ، بەواتای گەر درێژی تەنەکە زۆر بوو لە هەمان ساتدا ئەستوریش بوو ئەوا دەنگەکە گرە . بەلاّم گەر بەپێچەوانەوە بوو ئەوا دەنگەکە تیژە (زیلە)

هەروەها هێزی دەنگەکە بەپیێ لەرینەوەی تەنەکە بەتوندی یان بەسوکی ئەگۆرێ . بەواتای گەر تەنەکە بەهێز لەرایەوە ئەوا دەنگەکە بەهێز تر ئەبیۆ گەر بەسوکی لەرایەوە ئەوا دەنگەکە سوك دەبێت . ئەم دیاردەیەش پیێ ئەوترێ توندی دەنگ (شدة الصوت) .

هەروەها جۆری دەنگ (نوعیة الصوت) بەپیێ ئەو ئامێرەی لیێ دروست ئەبیێ ئەگۆرێ . بۆنمونە دەنگی (لا) کە لەرینەوەکەی (٤٤٠ ل س)ە گەر لە ئامێری کەمانچەوە پەیدا بوو جۆری دەنگەکەی جیاوازە لەگەلّ هەمان دەنگا کە لە ئامێری فلوت یان هەر ئامێرکی دی بێت پەیدا ئەبێ . هەر وەها هەمان دەنگ لە قورگی ئادەمیزادەوە بەجۆرێکی دی پەیدا ئەبیۆ هەرچەندە هەمان پلەی دەنگیشی هەبێت .

هەروەها هەمان پلەی دەنگی لە نیوان دەنگی ئادەمیزادیشدا دەگۆرێ . کەواتە دەنگی مۆسیقا سیفەتی تایبەتی خۆی هەیەو ئەتوانین بەم خالاّنەی لای خوارەوە دەست نیشانیان بکەین .

أ – پلەی دەنگ (درجة الصوت) :

ئەو سیفەتەیە کە گویێ ئادەمیزاد جیاوازی نیوان دەنگە بەرزو نزمەکانی پیێ ئەکا . پلەی دەنگیش بەپیێ لەرینەوەی ئەو تەنەی کە لیێ پەیدا ئەبیێ لە سانیەیەکدا دەست نیشان ئەکرێ .

ب – توندی دەنگ (شدة الصوت)

ئەو سیفەتەیە کە گویچکەی ئادەمیزاد جیاوازی نیوان بەهێزیو لاوازی (توندیو سوکی) دەنگەکەی پیێ ئەکا .

ج – جۆری دەنگ (نوعیة الصوت)

ئەو سیفەتەیە کە گویچکەی مرۆڤ هەست بەجیاوازی ئەو دەنگانە ئەکات کە لەیەك پلەی دەنگیدان بەلاّم جیاوازن لەو تەنانەی ئەبنە هۆی پەیدابوونی . وەکو چۆن جیاوازی هەیە لە نیوان دەنگی کەمانچەو دەنگی فلوت . جۆری دەنگیش بەسراوە بەژمارەو جۆری ئەو دەنگانەوە کە لەگەلّ دەنگیە سەرەکیەکەدا دەرئەکەون .

**٦ – دەنگی سادەو دەنگی لێکدراو (الصوت البسیط والصوت المرکب)**

هەموو دەنگە مۆسیقاییەکان کە گویچکەی مرۆڤ هەستیان پیێ ئەکا . کە لە ئامێرێکی مۆسیقاییەوە پەیدا ئەبن . پێك دێن لە چەند دەنگێکی یەك لە دوای یەك . هەر چەندە ئێمە بەو لێکدراوی‌یە نایبستین ، بەلاّم گەر هاتوو بووبە خولیای سەرمان ویستمان لیێ بکۆلینەوە ئەوا بەتەواوی ئەم دیاردەیەمان بۆ دەرئەکەوێ . ئەو دەنگە تەنهایانەی کە ئێمە گویمان لیێ ئەبی ، لە راستیدا چەند دەنگێکی دی لەگەلّ هەن . پیێیان ئەوترێ کۆمەلّەی دەنگە هاو دەنگیکەکان (مجموعة الاصوات التوافقیة)

(Partial tones) . بۆنمونە گەر هاتوو دەنگی (دۆ) لەسەر پیانۆ هاتە گویمان ، ئەوا ئەم دەنگە کۆمەلّە دەنگێکی یەك لە دوای یەکی تریشی لە تەکە ، ئەم دەنگانەش بەهۆی لەرینەوەی تەواوی ئەو ژێیەوەو دوای ئەو نیوەی ژیێکە هەروەها ١/٤ . ١/٥ . . . هتد پەیدا ئەبیێ .

ئەتوانین بلّێین ئەو دەنگانە بەپیێ رێژەی ١ ، ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٥ ، ٦ . . . پەیدا ئەبیێ . وەکو لەم خشتەیەدا .

خشتەی ڕێژەی دەنگە هاو دەنگیەکان .

| هاودەنگەکە | ڕێژەکەی | نمونەی دەنگ | درێژی ژێ | ژمارەی لەرینەوە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ١-١ | دۆی گەورە | ١٩٢ بۆسە | ٦٤ |
| ٢ | ٢-١ | دۆ | ٩٦ بۆسە | ١٢٨ |
| ٣ | ٣ - ١ | سۆل | ٦٤ بۆسە | ١٩٢ |
| ٤ | ٤ - ١ | دۆی (١) | ٤٨ بۆسە | ٢٥٦ |
| ٥ | ٥ - ١ | می (١) | ٤ر٣٨ بۆسە | ٣٢٠ |
| ٦ | ٦ - ١ | سۆل (١) | ٣٢ بۆسە | ٣٨٤ |
| ٧ | ٧ - ١ | سیb (١) | ٤ر٢٧ بۆسە | ٤٤٨ |
| ٨ | ٨ - ١ | دۆ (٢) | ٢٤ بۆسە | ٥١٢ |
| ٩ | ٩ - ١ | ری (٢) | ٣ر٢١ بۆسە | ٥٧٦ |
| ١٠ | ١٠ - ١ | می (٢) | ٢ر١٩ بۆسە | ٦٤٠ |
| ١١ | ١١ - ١ | فا (٢) | ٥ر١٧ بۆسە | ٧٠٤ |
| ١٢ | ١٢ - ١ | سۆلّ(٢) | ١٦ بۆسە | ٧٦٨ |
| ١٣ | ١٣ - ١ | لا (٢) | ٨ر١٤ بۆسە | ٨٣٢ |
| ١٤ | ١٤ - ١ | سیb (٢) | ٧ر١٣ بۆسە | ٨٦٩ |
| ١٥ | ١٥ - ١ | سی (٢) | ٨ر١٢ بۆسە | ٩٦٠ |
| ١٦ | ١٦ - ١ | دۆ (٣) | ١٢ بۆسە | ١٠٢٤ |

گەر سەیری ئەو خشتەیە بکەین چەند ڕاستیەکمان لا ڕون ئەبێتەوە ئەویش : ١ - ژێ لە ئامێرە ژێ دارەکانداو بۆری لە ئامێرە فودارەکاندا لەرینەوەی دەنگی هاو دەنگیان لێ پەیدا ئەبێ . تەنها لەرینەوە لەتەواوی ژێکە ، یان بۆری هەواکە پەیدا نابێ بەڵکو لە هەمان کاتدا لەرینەوەی دەنگی لە نیوەی ژێکە یان بۆری هەواکەو هەروەها ١/٢ ، ١/٣ ، ١/٤ . . هتد پەیدا ئەبێ . ئەم دیاردەیەش ئەوەمان بۆ ڕون ئەکاتەوە کە چەند دەنگێ لە هەمان کاتدا لەو لەرینەوانە پەیدا ئەبێ . دەنگە سەرکیەکە (بنکە) پێی ئەوترێ دەنگی بنچینەیان بنکە (Fundamental) کە لە هەموو دەنگەکانی دی بەهێز ترو دیارترە بۆ گویچکەی ئادەمیزاد .

ب - ئەو کۆمەڵە دەنگەی کە گویچکەی مرۆڤ بەتەنها دەنگێکی لێك ئەدانەوە لە ڕاستیدا چەند دەنگێکی یەك لە دوای یەکن (تألفات - chord) هەرچەندە جیاوازی‌یەکی ئەوتۆ هەیە لەگەڵ دەنگە هاو دەنگی‌یەکانی دی‌دا کە کۆمەڵی ئامێری مۆسیقای لێ‌ی ئەدەن ، بەلاّم لەهەمان کاتدا جیاواز نین لەڕوی دروست بونیانەوە . چونکە ئەمانیش مۆرکی هاو دەنگی یان پیوەیە . وەکو لەخشتەی پیشوودا دەی بینین لەنیوان دەنگی هاو دەنگی یەکەم‌و دووەمدا میانەیەکی (فاصلة) پەیژەی تەواو هەیە (اوکتاف) هەروەها میانەیەکی پێنج دەنگی لەنیوان دەنگی دووەم‌و سێ‌یەمدا هەیە . میانەیەکی چواری تەبا لەنیوان دەنگی سێ‌یەم‌و چوارەمدا هەیە .

میانەیەکی سیانی گەورە لەنیوان دەنگی چوارەمو پینجەمدا هەیە . لەنیوان دەنگی پینجەمو شەشەمدا میانەیەکی سیانی بچوك هەیە . لەنیوان دەنگی شەشەمو حەوتەمو حەوتەمو هەشتەمدا میانەیەکی بچوکتر لە میانەی سیانی بچوك هەیە . میانەیەکی تەواو لەنیوان دەنگی هەشتەمو نویەمدا هەیە .

میانەی نیوان دەنگەکان بەو جۆرە لەکەم بوندایە تا دەنگەکە زیل تر بێت . جگە لەونیومیانە دەنگی تەبایەی کە لە نیوان دەنگی پانزەو شانزە هەم دا هەیە .

ج — بەو دیاردانەی باسمان کرد بۆمان دەرئەکەوێ کە : ئەو کۆمەڵە هاو دەنگیانە مانای تەواوی خویان هەیەو بەشیوەی زانیاری چەسپاون بۆنمونە گەر دەنگی چوارەم لەریزی ئەو کۆمەڵە هاو دەنگیانە وەربگرین ئەم دیاردانەی لای خوارەوەمان بۆدەر ئەکەوێ .

١ — ئەو میانەیەی دەنگیە لە لەرینەوەی چواریەکی ژێ سەرەکیەکە پەیدا بووە ، دوو جار کەمترە (لە لەرینەوەی درێژی ژێ‌کە) لە دەنگی دووەمی کۆمەڵە دەنگیەکە .

٢ — ئەو دەنگە لە لەرینەوەی $\frac{1}{4}$ی ژێ‌کە پەیدابووە . دوو پەیژەی دەنگی (اوکتافان) بەرزترە لە دەنگی بنکە . یەك پەیژەی دەنگی تەواو بەرزترە لە دەنگی دووەم . بەواتایەکی دی دەنگی چوارەم لەو کۆمەڵە هاو دەنگیە بەگویرەی رێژەی ٤ ، ٣ بەرزترە لە سێیەم دەنگیەکەی پێش خۆی .

د — ژمارەی لەرینەوەکان زۆر بوو ئەوا درێژی کەمتر دەبێت وەکو دەنگی سێیەم کە ٦٤ بۆسەیە دەنگی چوارەم ٤٨ بۆسەیە بەلام لەرینەوەکانیان ١٩٢ بۆ ٢٥٤ لەرینەوەیە لە سانیەیەکدا .

خشتەی ئەو دەنگانەی کە یەك لە دوای یەك دەبیسترێن لەگەل دەنگە سەرەکیەکەدا بەنۆتەی مۆسیقا .

(نمونەی ژمارەیەك)



سەرچاوەکان


١ — مەنهەجی پەیمانگای هونەرە جوانەکان سلیمانی ئامادەکردنی صلاح رؤوف
٢ — مەنهەجی پەیمانگای هونەرە جوانەکان بغداد ئامادەکردنی حسین قدوری
٣ تمهید الفن الموسیقي تألیف ماکس پنشار ترجمه محمد رشاد بدران
٤ — نظریات الموسیقی تألیف اولف دانهاوزر ترجمه محمد رشاد بدران
٥ الموسیقی النظریة تألیف الدکتور حسین فوزی
٦ — تراث الموسیقی العالمیة تألیف کورت زکی
٧ — مبادئ الموسیقی النظریة تألیف ف . أ . فاخارومیف . ترجمة رؤوف موسی الکاظمی
٩ — الموسیقی النظریة تألیف سلیم الحلو .
١٠ — قواعد الموسیقی الغربیة وتذوقها تألیف الدکتور محمد محمود سامی حافظ
١١ — تربیة السمع تألیف سعاد علي حسنین
١٢ — طرق تعلیم الموسیقی تألیف عائشة صبري
١٣ — الهارمونی العملي تألیف عواطف عبدالکریم
١٤ — تیوری موسیقا مصطفی پورتراب
١٥ — الهارمونی تألیف البروفیسور . باراشکیف خادچییف ترجمه الدکتور مکی سید احمد
١٦ — نظری موسیقا روح‌الله خالقی جزء (١ ، ٢)

# سروشت

# دوو جار نایەتەکایەوە

دلێر ئەحمەد ئاکۆ
پسپۆری مۆری پەنجەو پێ

لە ژمارەی ۳۷ی گۆڤاری کاروانی ساڵی ۹۸۵ باسێکمان بلاوکردەوە بەناوی مێژووی پەنجە مۆر ، باسی ئەم زانستیەمان کرد کە چۆن دەرکەوت و هاتەکایەوە لەلایەن زانایانو کۆلتور ناسەکانو تۆژەرەوەکان . چۆن توانیان مۆری پەنجە بەشێوەیەکی زانستی پۆلین (CLASSIFICATION) بکەن بۆ بەکار هێنانی لە لایەن هەموو پۆلیسی جیهانەوەو ، چۆن ئەم زانستە بووە رێگایەکی زۆر بە نرخو راستەقینەو تایبەتی بۆ ناسینو سزادانی تاوانباران ، هەموو دادگاکانو پیاوانی یاسا لە جیهان دانیان بەم زانستە داناوە تا دێ دنیا بەرەو پێش‌کەوتنەو تەکنۆلۆجیای نوێو بەکار هێنانی کۆمپیوتەر بەرەو پەرەسەندنەو زانست پێش دەکەوێ بۆ راژەی مرۆڤایەتی ، وە هەرچەند تاوانبارانی جیهان هەوڵ بدەن بۆ دۆزینەوەی رێگای نوێ بۆ جێ‌بەجێ کردنی تاوانەکانیان بەرامبەر بە پیاوانی پۆلیسی جیهان (INTERNATIONAL POLICE)و زانایانو تۆژەرەوەکان ، رێگای باشتر دەدۆزنەوە بۆ ئاشکرا کردنیان .

هەروەك ووتراوە کە «سرووشت دوو جار نایێتە کایەوە» لە سەر ئەم واتەیە وا دەردەکەوێ کە هەر شتێ لە جیهان ئەدگارو سیفەتی تایبەتی خۆی هەیە .

بۆ نموونە دوو پێنووس هەر چەند لە یەك جێگاو لە یەك کارگاو لە یەك بابەت دروست کرابێ ئەبینین بە شێوە لە یەك دەکەن بەلام ئەگەر هاتوو بە میکرۆسکوب تەماشای گردیلەی (MOLECULES) ووردیان بکەین ئەبینین کە جیاوازێکی زۆریان هەیە .

زانایانو توێکارکاری (ANATOMIST) ئاژەڵ پاش چەند تاقی‌کردنەوەیێکی زانستی بەسەر چەند ئاژەڵێکدا وەك ئەسپو مانگاو سەگ بۆیان دەرکەوت کە لوتی سەگ لە چەندەها خانەی CELL بچوك پێك هاتووە . پاش وەرگرتنی مۆری لوتەکەوە چەند لایی کردنی (COMPARATIVE) لە گەڵ لوتی سەگێکی تر بۆیان چەسپاندرا کە لوتی هەر سەگێ جیاوازی هەیە لە گەڵ لوتی سەگێکی‌تر ، وەهەر وەها بە نسبەت ئاژەڵەکانی‌تر . جا بۆ ئەم مەبەستە ئێستا هەندێ دەزگاکانی بەخێو کردنی سەگی پۆلیسیو بازرگانی مۆری لوتی سەگەکان تۆمار ئەکەن بۆ ناسینەوەو جیاوازی کردنەوەیان . وەك لە پێشو باسمان کرد کە مۆری پەنجە بەکەڵکترین رێگایەکی زانستیە بۆ ناسینی خاوەنەکەی چونکە مۆری هیچ کەس لە هینی کەسێکی تر ناکات وەهەر مۆرێ ئەدگارو سیفەتی تایبەتی خۆی هەیە . بۆ ئەم مەبەستە زۆرترین نەخۆشخانەکانی منالان لە



ووڵاتانی دەرەوە ڕێگای وەرگرتنی موری پەنجەو ناو لەپ‌و بنی پیّی منالّی تازە لە دایك بوو وەردەگرن ، مەبەستیان لەمەش ئەوەیە کە ئەگەر هاتوو ئیشکەرانی نەخۆشخانە کە منالّەکەیان گۆری جا چ بە ئەنقەست یا بەکەم تەرخەمی ئەوا بە بۆنەی مۆری پەنجەو ناو لەپ‌و بنی پیّ ئەی ناسنەوە چونکە ئەم مۆرانە لە ناو ئەوراق منالّەکە هەلّ ئەگیردریّ ، ئەمەش ڕێگایەکی زۆر بەنرخە بۆ ئەو دایکانەی کە لە نەخۆشخانە منالّیان ئەبیّ‌و لیّان ئەترسن لە گۆرینیان .

هەر وەها مۆری پەنجە یەکەم ڕێگایە بۆ ناسینی ئەو کەسانەی کە مردوون‌و تەرمەکەیان فریّ دراوەو هیچ کاغەزو کارتی پێناسەیان پیّ نیە بۆ ناسینەوەیان ، جا بە بۆنەی وەرگرتنی مۆری پەنجەیان‌و چەند لایی کردنەوەی لە گەلّ ئەو مۆرانەی کە لە پێش مردنیان وەرگیراوە ئەتوانن ناوی تەرمەکە بدۆزنەوە .

ئێستا ئێمە لە عیراق ئەم ڕێگایە بەکار دێنین‌و ، توانیومانە چەندەها کەس بدۆزینەوەو تەرمەکەیان تەسلیمی خاوەنیان بکەینەوە . ئەم ڕێگایەش زۆر ڕێك‌و پێکەو هیچ هەلّەی تیا نیە .

لە سالّی ١٩٠٦ لە شاری تۆرینتۆ لە ئیتالیا کۆبوونەوەیەکی مێژووی سروشتی جینائی کراو ، دانیان بەوە دانا کە ویراسەت (GINTES) هیچ کارتیّ کردنێکی نیە لە سەر ئەو هێلّە زبرکانەی (PAPILLARY RIDGES) کە لە سەری پەنجەو ناو لەپ‌و بنی پیّدا هەیە ، ئەمەش بەو لێکۆلّینەوە دەرکەوت کە لەسەر بربرەی پێنج نەوە کرا لە خێزانێك‌دا .

ئێستا یاش ئەوەی نیزیکەی سەد سالّ تیّ‌پەری بەسەر دۆزینەوەی مۆری پەنجەو بەکار هێنانی لێکۆلّینەوەیەکی زانستی زۆر دەکریّ بۆ دۆزینەوەی چەند ڕێگایەکی تر بۆ ناسینی تاوانباران ، تا بتوانن بە زووترین کات تاوانبار بگرن‌و نەهێلّن لە چنگی یاسا رزگاری بیّ .

پیاوانی یاساو پۆلیسی هەولّ دەدەن کە تیپی تایبەتی ئامادەبکەن وە بە زووترین کات بگەنە شوێنی تاوانبارەکان‌و هەولّ دەدەن فێری باشترین مەشقیان بکەن بۆ چۆنیەتی دواکەوتنی تاوانبارو شوێن هەلّگرتن بە شێوەیەکی هونەری‌و . ئەم تیپانەش پێك دێن لە پسپۆری مۆری پەنجەو بزیشك‌و



کیمیاوی‌و زانایانی تر .

وەلە ئەنجامی ئەم هەول‌و تەقەلایەدا ئێستا زۆر رێگای تریان دۆزیتەوەو ، ئەیانەوێ بەکاری بهێنن بۆ ئاشکرا کردنوو دوا کەوتنی تاوانبار . ئەم رێگایانەش شۆرشێکی نوێ‌و بەرازە بە دەروازەی جینائی بۆ نەهێشتنی تاوان‌و تۆقاندنی دەوڵەتان (INTERNATIONAL TERRORISM). وە دەیانەوێ هەموو تاوانێك دەستی بەسەردا بگرن‌و ، دەروازەیان نەدەن ، چونکە تاوانباری ئێستا خوێندەوارو تێگەیشتوەو ، رەنگە دەستی سیاسیشی هەبێ‌و ، زور بە پوختی مەشق لە سەر جێ‌بەجێ کردنی تاوانەکەی دەکا ، هەندێ لەم رێگایانەش وەك ، مۆری دەنگ :- بۆمان روونە کە هەر دەنگی لەرینەوەی (VIBRATION) تایبەتی خۆی هەیە پزیشك‌و زانایانی زانستی دەنگ (PHONOLOGY) پاش چەند لێکۆڵینەوەو تاقی‌کردنەوەیەك بۆیان دەرکەوت کە هەر کەسێ . هێزی دەنگی (PITCHES) نیشانکراوی تایبەتی هەیە کە لە ژێ‌یەکانی دەنگ دەر ئەچێ وەناتوانی بیگۆری‌و بزری بکا لە ئەگەر چەند هەول‌و تەقەلا بدا . ئینجا هەندێ زانایانی وولاتانی ئەوروپا بە تایبەتی ئەلەمانیای رۆژئاوا توانیان لەرینەوەی دەنگی مرۆڤ بچەسپێنن وە لەسەر کارتی کەسایەتی تۆماری بکەن‌و وە لە ئەرشیفی شالیاری ناو خۆ بیپارێزن . وە توانیان بە بۆنەی موری دەنگ ئەو مرۆڤە بدۆزنەوە کە بەتەلەفۆن هەرەشە لە خەڵك دەکا ، وە هەر وەها ئەو کەسانە ئاشکرا بکەن کە کرداری تۆقاندن (TERRORIST'S PROCESS) دەکەن . پاش تەلەفۆن کردنیان .

**مۆری لێو :-**

ئەو تاقی‌کردنەوانەی زانستی‌و کارگەی کراوەو ئێستا کە دەکرێ لە لایەن توێکارکاران‌و پسپوران وا دەرکەوت کە هەر لێوێ ئەدگارو هێلی تایبەتی هەیە لە قەرەشتینو جۆرایەتی پسپورانی موری پەنجە توانیان مۆری لێو هەڵ بگرن لە شوێنی تاوان لەسەر



پاشماوەی خواردن‌و قونکی جگەرە کە تاوانباران بەکاریان هێنابوو وچەند لای بکەن لە گەڵ لێوی ئەو کەسانەی کە شکیان لی ئەکەن . توێژەرەوەکان تەنگ‌و چەلەمەی زۆریان هەیە بۆ هەڵگرتنی مۆری لێو بەشێوەیەکی هونەری ، بەلاّم زانایانی ئەمەریکاو ئەلەمانیای رۆژ ئاوا بەم دواییە وایان راگەیانت کە توانیتیان بابەتێکی کیمیاوی بدۆزنەوە بۆ هەڵگرتنی مۆری لێو بە شێوەیەکی زۆر چاك‌و ئاسان .

**مۆری گوێ :-**

بەکار هێنانی ئەم رێگایە کەوتە کایەوە پاش ماندوو بونێکی زۆر بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە مەوبەر لە لایەن توێژەرەوەکان . وا دیار کەوت کە هیچ شك لەوە دانیە کە تا ئێستا دوو گوێ نیە بە یەك بچێ لە هەموو ئەدگارو سیفاتێکەوە وە ئەگەر هاتوو ئەم دوو گوێ‌یەش هینی یەك مرۆڤ بیت ، چونکە گوێ راست لە گەڵ گوێ چەپ جیاوازی هەیە . بۆ ئەم مەبەستە تاقی‌کردنەوەیەکیان کرد لەسەر (٦٠٠) کەس‌دا وەپاش



لێکۆلینەوە ئەنجامێکی زۆر باش دەرکەوت‌و واچەسپاندرا کە چەتری گوێچکە لە کرکراگەی (CARTLAGE) تایبەتی پێك‌هاتووەو وە وێنەیەکی تایبەتی پێك دێنیٚ لە بەرزو نزم‌و قۆرتایی وە جیاوازی هەیە لە مرۆڤیٚ بۆ مرۆڤێکی تر. بەلاٚم تا ئێستا چەند تەنگ‌و چەلەمەیەك رێگای تۆژەرەوەکانی کارگەی جنائی گرتووە ئەمیش بۆ هەلگرتنی مۆری گویٚ ، چونکە لەکاتی هەلگرتنی مۆرەکە ئەبیٚ مۆرەکە بە تەواوی چاپ بوو بیٚ بۆ ئەوەی هەموو گۆشەکانی دیار بیٚ وێنە گرتنی‌و چەند لای کردنەوەی . سەرەرای ئەمەش توانیان تا ئیستا چەند مۆریٚ هەلگرن لەسەر دەرگاو تەلەفۆن .

ئەوانەی باسمان کرد هەمووی چەند رێگایەکە بۆگرتنی‌و دوا کەوتنی تاوانبارو ناردنیان بۆ دادگا بەلاٚم تا ئێستا هیچیان ناگەنە موری پەنجە لەبەر ئەوەی هێزێکی یاسایی تایبەتی هەیە بۆ چەسپاندن لە دادگا وە هەموو پیاوانی دادگا لە جیهان‌دان بەو بەلگەیە دادەنین بۆ سزادانی تاوانبار ، چونکە مۆری پەنجە هیلی زبرو وێنەی تایبەتی خۆی هەیەو وە رێگایەکی دەولەتی هەیە بۆ پۆلینی هەر چەندە ئەوانەی باسمان کرد نرخی تایبەتی یاسایی خویان هەیە .

بەلیٚ کاروانی زانستی بەرەو پێش‌کەوتنەو هیچ هێزیٚ نیە رێگای وەستانی بگریٚ ، وە تانووسینی ئەم باسە تاقی‌کردنەوەو لێکۆلینەوە بەردەوامە بۆ راژەی مروڤایەتی بەتایبەتی وا ئێمە بەرەو چەرخی بیست‌و یەك ئەروێن‌و تاوان نەك لەسەر زەمین بەلکووا گەیشتە ناو مانگ‌و گشپۆشەوە (OUTER SPACE) .

## «سەرچاوەکان»


١ – ابراهيم غازى – علم البصمات . من منشورات المكتب الدولى العربى للشرطة الجنائية دمشق / سوريا .

٢ – اللواء الدكتور چيرنى ، خبير جيكوسلوفاكى ، محاضرات حول كشف الجريمة بغداد ١٩٨٣

٣ – دلير أحمد اكو . أثر طبعات الاصابع في الاثبات الجنائي ، بحث ، بغداد ١٩٨٤

٤ – ملحق جريدة السياسة الكويتية في ١٩٨٦/٢/١

٥ –

INTERNATIONAL CRIMINAL POLICE REVIEW

No – 228. 1969 . PARIS


## فەرهەنگۆك

| | |
|---|---|
| ١ – کۆلتورناس | علماء الاثار |
| ٢ – تۆژەرەوە | باحث |
| ٣ – پۆلین | تصنيف |
| ٤ – گردیلە | جزئيات |
| ٥ – تۆێکارکاری | طب التشريح |
| ٦ – چەند لای | مضاهاة |
| ٧ – ئەدگار | مميزات |
| ٨ – بووماوە | وراثة |
| ٩ – هێلەکانی زبر | الخطوط الحلمية في الكف وباطن القدم |
| توقاندنی دەولەتان | الأرهاب الدولي |
| ١١ – کرکراگە | غضروف |
| ١٢ – بۆشایی ئاسمان | الفضاء الخارجي |

# شتێك دەربارەی تەلەپاسی

Telepathy

ئارام قەرەداغی

میخائیل لۆمۆنۆسۆڤ جارێکیان کە لە ئەڵمانیاوە دەگەڕێتەوە بۆماڵەوە لە خەویدا دەبینێ بەلەمەکەی باوکی لە ئوقیانووسی بەستەڵەکدا تێك دەشکێ‌و لە دوورگەیەکی چۆڵدا دەگیرسێتەوە . لۆمۆنۆسۆڤ کاتی خۆی بە منالّی لەگەڵ باوکیدا جارێك چووبوە ئەم دوورگەیە . هەرکە دەگاتە ماڵەوە دەبیستێ باوکی لەگەڵ چەند ڕاوچی‌یەکی تردا چوون بۆ ڕاوە ماسی‌و هێشتا نەگەڕاونەتەوە . لۆمۆنۆسۆڤ نیگەران دەبێ‌و بە دوورو درێژی وەسفی دوورگەکە بۆ براکەی دەکاو دەنێرێ بە دوای سوراخی باوکیدا لە ڕاستیدا ڕاوچی‌یەکان لە هەمان ئەو دوورگەیە تەرمەکەی باوکی لۆمۆنوسۆڤ دەدۆزنەوە .

ڕەنگە لەناو ئێمەو کەسوکاری ئێمەشدا هەبێ خەونی لەو جۆرەی لۆمۆنۆسۆڤ دیبێ کە تیایدا خەون بین ئاگاداری‌یەك پەیدا دەکات لە بارەی حاڵەت‌و ژیانی کەسێکەوە . یاخود ئەشێ مرۆڤ بە هۆشیاری بتوانێ زانیاری لەبارەی کەسێکی دوورەوە بە دەست بهێنێ بێ بەکارهێنانی ئەندامەکانی هەست بو نموونە ئەگەر دایکێك لە پڕێکدا هەست بکات منالّەکەی لە تەنگوچەڵەمەدایە بە مەرجێك هیچ پەیوەندی‌کردنێکی زانراو نەبێ لە نێوانیانداو ئەگەر ڕاست دەرچێ ، منالّەکە لە هەمان کاتی هەست پی‌کردنی دایکەکەدا لە تەنگوچەڵەمەدا بووە ئەوا ئەم دیاردەیە پی‌ی دەوترێ تەلەپاسی‌و زانیاری‌یەکە واتە هەست کردن بە تەنگوچەڵەمەی منالّەکە پی‌ی دەوترێ بروسکەی تەلەپاسی .

تەلەپاسی (واتە ئاگا لی‌بوون لە دوورەوە) کاتێك دەڵێین ڕووی داوە ئەگەر کەسێك دۆخێکی دەروونی‌و ئەقڵی وای هەبێ کە بە تەواوی یا تا ڕادەیەك لە دۆخی دەروونی‌و ئەقڵی‌ی ڕابوردوو ، ئێستا یان داهاتووی کەسێکی تر بچێ ، چ زیندوو چ مردوو ، بە مەرجێ هیچ پەیوەندی کردنێکی ئاسایی لە ڕێگەی ئەندامەکانی هەستەوە لە نێوان ئەو دوو کەسەدا نەبێ‌و مەسەلەکە لە بواری ڕێکەوتیشدا نەبێ .

هەزارەها تۆماری پەیوەندی بەستنی تەلەپاسی هەیە لە نێوان ئەو کەسانەدا کە پەیوەندی‌یەکی عاتیفی بەهێز لە نێوانیاندا هەیە



وەك ژنو مێرد ، باوانو منالٚ خوشلكو برا و تیایدا یەکیٚ لەمانە هەست بە تەنگوچەڵەمەی ئەوی تر دەکا دەڵێن گوایە چاکترین پەیوەندی تەلەپاسی لە نێوان منالٚی دوانەی هاویەکدا ڕوو دەدات کە دەردەداری هەمان نەخۆشینو ژیانیان چوونیەکە . بە هەر حالٚ لە لێکوڵینەوەی زانستیدا ناتوانین پشت بەم چیرۆکانەی ڕابوردوو ببەستین .

یەکێك لە دژوارترینی ئەو تاقیکردنەوانەی بۆ هەڵسەنگاندنی توانای مرۆڤ کراون لە بواری هەڵهێنانی زانیاری شاراوەدا ئەوەبوو کە لە سەرەتای سی‌یەکانی ئەم سەدەیەدا لەلایەن ڕاینو هاوڕێکانی‌یەوە لە زانکۆی دووك کرا .

ڕاین دەستەیەك وەرەقەی زێنەری بەکار هێنا کە پێك هاتووە لە بیستو پێنج وەرەقەو هەر پێنجیان جۆرە وێنەیەکی لەسەر کێشراوە کە ئەمانەن : چوار گۆشە ، بازنە ، خاچ ، ئەستێرە وە هێڵی شەپۆلی . واتە ڕێژەی هەڵهێنان پێنج وەرەقەیە لە هەموو وەرەقەکان . بەلاٚم ڕاین لە ژمارەیەك ئەزموونددا بۆی دەرکەوت کەسانی واهەن ئەنجامی چاکتر بەدەست دێنن کچە قوتابی‌یەکی نۆ ساڵانی خێزانێکی بەخت نەیار کە لە قوتابخانە تاقیکرایەوە بیستو سیٚ دانەی لە بیستو پێنجەکە هەڵهێناو کە

له تاقیگه‌ی دووك له‌لایه‌ن زانایه‌کی ناسیاویه‌وه تاقیکرایه‌وه هه‌ر هه‌مووی هه‌ڵهێنا هۆبێرت پێرێسیش جارێکیان که ڕاین داوای لێ‌کرد ئه‌نجامی باش به‌ده‌ست بێنێ هه‌موو وه‌ره‌قه‌کانی به‌ڕاستی هه‌ڵهێنا . ئه‌م دوو ئه‌نجامه ده‌گمه‌ن بوون به‌ڵام ملیۆنه‌ها تاقیکردنه‌وه به‌ڵگه‌یه‌کی ئاماریمان ده‌ده‌ن به‌ده‌سته‌وه له باره‌ی توانای ته‌له‌پاسی مرۆڤه‌وه . له ڕاستیدا هه‌ندێ له زانایان له‌و باوه‌ڕه‌دان ئه‌م جۆره تاقیکردنه‌وانه توانای ته‌له‌پاسی سه‌رکوت ده‌که‌ن چونکه وه‌رگرتنی په‌یامی ته‌له‌پاسی پێویستی به خاوبوونه‌وه‌و هێمنی‌و خۆبه‌سه‌رێتی هه‌یه نه‌ك داواکردنی یه‌ك له‌سه‌ر یه‌ك . گاتیه‌ر برات ده‌ڵێ «ئه‌م هه‌ڵهێنانی وه‌رقه‌یه ئوسلوبێکی بێ که‌ڵکه‌و چالاکی ته‌له‌پاسی سه‌رکوت ده‌کات» . لۆتسیا پاڤلۆڤای سۆڤێتیش ده‌ڵێ ئه‌م تاقیکردنه‌وانه‌ی ڕاین که تیایدا ده‌بێ له ماوه‌یه‌کی که‌مدا ژماره‌یه‌کی زۆر زانیاری هه‌لبهێنرێت گرانترین ڕێگه‌یه بۆ به‌ده‌ست هێنانی ته‌له‌پاسی چونکه ئه‌گه‌ر خێرا خێرا داوای زانیاری بکه‌ین ئه‌و گۆڕانانه‌ی له مێشکدا ڕوو ده‌ده‌ن‌و په‌یوه ندی‌یان به ته‌له‌پاسی‌یه‌وه هه‌یه ته‌ڵخ ده‌بن‌و سه‌ره‌نجام نامێنن .

چاره‌سازی ده‌روونی ڕووسی کۆنسانتین پلاتۆنۆڤ توانیویه‌تی به بێ قسه‌و ته‌عبیر هه‌ر به ئه‌قڵ خه‌و له خه‌ڵك بخات . لیۆنید ڤاسیلییێڤ له سی‌یه‌کاندا سه‌لماندی ده‌توانێ خه‌و له خه‌ڵك بخات‌و خه‌به‌ریشیان بکاته‌وه بێ‌قسه‌و ئه‌گه‌ریش په‌رده‌یه‌کی وا له نێوان خه‌وێنه‌رو خه‌و لێ‌خراویشدابێ که ڕێ به تیپه‌ڕبوونی شه‌پۆلی ڕادیۆیی نه‌دات .

ئه‌کادیمی ڤلادیمیر به‌خته‌ریڤ‌و پیۆتر لازارێڤ له‌و باوه‌ڕه‌دان له بارو دۆخی تایبه‌تیدا که هێشتا زانست په‌ی پێ نه‌بردووه هێزی کاره‌بایی مێشکی که‌سێك ده‌توانێ له دووری‌یه‌که‌وه کار له مێشکی که‌سێکی تر بکات‌و ئه‌گه‌ر ئه‌م مێشکه ئاماده‌و له‌بار بێ له‌رینه‌وه‌یه‌کی بایۆکاره‌بایی تێدا دروست ده‌بێ‌و بیرو خه‌یاڵی وه‌ك مێشکی که‌سی یه‌که‌می تێدا ده‌خولقێ .

له‌م دوایی‌یه‌دا له په‌یامگای فسیۆلۆژیای لینینگراد تاقیگه‌یه‌کی تایبه‌تی له ژێر چاودێری ڤاسیلییێڤ‌دا کرایه‌وه بۆ لێکۆڵینه‌وه‌ی ته‌له‌پاسی . له نۆزده‌ی نیسانی ساڵی ۱۹٦٦دا کارل نیکولایێڤ که ئه‌کته‌ره له نۆڤۆسیبرسك توانی به ته‌له‌پاسی په‌یوه‌ندی بکات له‌گه‌ڵ یوری کامینسکی هاوڕێدا که زانایه‌کی فیزیای ژیانه له مۆسکۆ واته ۱۸٦۰ میل له یه‌که‌وه دووربوون . هه‌ردووکیان له‌ژێر سه‌رپه‌رشتی زانایاندا بوون‌و له تاقیکردنه‌وه‌یه‌کدا زاناکان پاکه‌تێکی پێچاوه‌یان خۆبه‌سه‌ری دایه ده‌ست کامینسکی ، ئه‌میش ده‌یکاته‌وه‌و ده‌ستی پێدا دێنێ‌و لێی ورد ده‌بێته‌وه وه‌ك بیه‌وی له چاوی هاوڕێ‌که‌یدا ببینێ . پاکه‌ته‌که سپرنگێکی کانزای تێدا بوو که له حه‌وت پێچ پێکهاتبوو . له هه‌مان کاتدا نیکۆلایێڤ له نۆڤۆسیبرسك ئه‌م ئینتیباعه‌ی له باره‌ی پاکه‌ته‌وه نووسی «خره ، کانزایه ، بریقه‌ی دێ ، چه‌ماوه‌یه ، له کۆیل ده‌چێ» . پاش ده ده‌قیقه کاتێ له ده‌ره‌نه‌فیزێکی ده‌سك پلاستیکی ڕه‌ش ورد ده‌بۆوه نیکۆلایێڤ وتی «درێژ و باریکه ، کانزایه ، پلاستیکه ، پلاستیکێکی ڕه‌شه .» لێکدانه‌وه‌ی ئه‌م دوو نموونه‌یه به ڕێکه‌وت شتێکی ناماقووله‌و ناچارین بڵێین جۆره په‌یوه‌ندی کردنێکی نائاسایی له نێوان مێشکی نیکۆلایێڤ‌و کامینسکی‌دا ڕووی داوه‌و وای کردووه گۆڕانێکی له‌و جۆره‌ی له مێشکی کامینسکی‌دا ڕووی داوه له کاتی وه‌رگرتنی پاکه‌ت‌و ده‌ره‌نه‌فیزه‌که‌دا ، له مێشکی نیکولایێڤ‌دا ڕوو بداو به‌شێك له‌و ئینتیباعه ده‌ربرێت که کامینسکی هه‌ستی پێ کردووه .

دوای ئه‌مه ته‌له‌پاسی له یه‌کێتی سۆڤێت بایه‌خێکی زوری پێ دراو کۆمه‌ڵێك زانا کۆبوونه‌وه له ژێر ناوی به‌شی بایۆزانیاری کۆمه‌ڵه‌ی زانست‌و ته‌کنیکی هه‌موو سۆڤێتی أ . س . پۆپۆڤ بۆ ته‌کنۆلۆژیای ڕادیۆیی‌و په‌یوه‌ندی به‌ستنی کاره‌بایی . یه‌که‌م کاری به‌شه لێکۆڵینه‌وه‌ی هه‌مان دوو مرۆڤ بوو . له مارتی ۱۹٦۷دا کامینسکی یان له مۆسکۆ داناو نیکولایێڤیان برد بۆ تاقیگه‌یه‌ك له لینینگرادو له‌وێ خستیانه ژوورێکی چۆڵه‌وه که ده‌نگی تیادا

ناگوێزرێتەوەو بە ستیانبە چەند ئامێرێکەوە بۆ تۆمارکردنی چالاکی لەش. نیکۆلاییێف تۆزێکی پێچوو تا چووە دۆخی وەرگرتنەوە کە وەك خۆی دەڵێ بریتیە لە (خاوبوونەوەیەکی تەواو بەڵام وریا) کە تەواو ئامادە بوو کارۆگرافی مێشکی شەپۆلی ئەلفای تۆمارکرد. بێگومان بە نیکۆلاییێفیان نەوتبوو کەی کامینسکی بروسکە تەلەپاسیەکەی دەنێرێ، کەچی تەنیا سێ چرکە دوای ئەوەی لە مۆسکۆ بە کامینسکی وترا بروسکەکەت بنێرە شەپۆلەکانی مێشکی نیکۆلاییێف لە لینینگراد تێکچووو ئەلفا نەما. بەڵێ ئەمە یەکەم بەڵگەی بەرچاوبوو لە بارەی گواستنەوەی زانیاریەوە لە مێشکێکەوە بۆ مێشکێکی تر بە درێژایی چوار سەد میل.

دوایی دەرکەوت چالاکی مێشکی نێرەرو وەرگر هەردووکیان دەگۆڕێت. دەستەی پۆپۆف دەڵێن «ئەو چالاکیە نائاسایییەی مێشك ماوەی ١-٥ چرکە دوای دەست پێکردنی ناردنی بروسکە تەلەپاسییەکە دەست پێ دەکاو نیکۆلاییێف دوای یەك دوو چرکە لەو گۆڕانە ئینجا ئاگاداری بروسکەکە دەبێ.» لە سەرەتاوە چالاکییەکە بەشی پێشەوەو ناوەڕاستی مێشك دەگرێتەوە بەڵام کە نیکولاییێف بە بروسکەکە دەزانێ ئەو بەشەی مێشك دەهەژێ کە پەیوەندی بە سروشتی بروسکەکەوە هەیە بو نموونە ئەگەر بروسکەکە پێویستی بە بینین بێ تەنیا پلی پشتەوەی مێشك دەهەژێ کە لە ڕاستیدا شوێنی بینینە خۆ ئەگەریش بروسکەکە قسەو دەنگە دەنگی تێدابێ ئەوا پلی لاجانگی دەهەژێ کە شوێنی بیستنە.

ئەوەی شایەنی باسە دەرکەوتووە لە کاتی پەیوەندی بەستنی تەلەپاسیدا سەرجەمی شەپۆلەکانی مێشکی نێرەرو وەرگر وەکو یەکی لێدێ. ئەگەر بە هۆی ڕووناکییەکی ترپەکەریشەوە شەپۆلی مێشکی نێرەر بگۆڕین مێشکی وەرگریش بە هەمان شێوە دەگۆڕێ. لە تاقیکردنەوەیەکدا کامینسکی دووربینێکی ڕوو تێکرا کە لە هەر چاوەیەوە بە ترپەترپێکی جیاواز ڕووناکی لێ دەردەچوە بەم جۆرە لە هەر لایەی مێشکیدا جۆرە شەپۆلێك دروستبوو ئەمەش بوو بە هۆی دڵ تێك هەڵاتنی کامینسکی لە هەمان کاتدا هەمان گۆڕان لە مێشکی نیکۆلاییێفدا ڕووی داو ئەمیش کەوتە هێڵنجدان. لە فیلادلفیاش دەرکەوتووە گۆڕانی چالاکی مێشکی یەکێ لە دوو برای دوانەی هاویەك دەبێتە هۆی ڕوودانی هەمان گۆڕان لە مێشکی براکەی تریدا.

لیکۆڵەرەوەکان لەو باوەڕەدان خاوبوونەوەی جەستەیی و کەم بوونەوەی چالاکی ماسوولکەو تەرکیز نەکردن لە سەر شت یان بە کورتی وریایییەکی سست Passive attention واتە وریایی بەبێ تەرکیزکردن هەلومەرجی پێویستن بۆ ڕوودانی تەلەپاسی. بە پێچەوانەشەوە هۆشیاریو شپرزەیی دەبنە هۆی سەرکوتکردنی بروسکەی تەلەپاسی. بە مانەیەکی تر دەتوانین بڵێین وەرگرتنی بروسکەی تەلەپاسی لە بواری ئەقڵی هوشیاردا ڕوو نادات بەڵکوو کاتی ڕوو دەدات هوشیاری کشابێتەوەو نەست (لاشعور) زاڵ بووبێ. بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەمەش جگە لە هەلومەرجی ئاسایی ڕوودانی تەلەپاسی ئەوەیە دیاردەی تەلەپاسی لەو کاتانەدا زیاتر ڕوودەدات کە نەست تیایدا زاڵە لە وێنەی خەونو خەواندنو هەلومەرجی دەروون شیکاری. فرۆید لەو باوەڕەدابوو بروسکەی تەلەپاسی لە دانیشتنی دەروون شیکاریدا باشتر ڕوو دەدات چونکە نەست خراوەتە ڕوو بۆ لێکوڵینەوە. سیر ولیام بارێتی فیزیازان لە یەکێ لەو تاقیکردنەوانەدا کە بۆ خەواندنی کچێك کردوویەتی دەڵێ. «پاش خەواندنی لە پشتیەوە وەستامو چاوم قایم بەستەوە، ئینجا تۆزێك خوێم خستە ناو دەمم، کچەکە یەکسەر وتی بۆ ئەو خوێیە دەخەیتە دەممەوە! پاشان شەکرم خستە دەمم. کچەکە وتی ئێ ئەمە باشترە. کە لێم پرسی چۆنە وتی شیرینە. دوای ئەوە بیبەرو زەنجەبیلو شتی ترم خستە دەمم کچەهەشتی بە تامی هەموویان دەکرد. کەچی کە دەمخستە دەمی خۆیەوە گوێی پێ نەدەدان.»

ئەم جۆرە پەیوەستییە هێشتا نەسەلمێنراوە بەڵام ئەگەر

ڕاست بێ جگە لەوەی بەڵگەیەکی ترە بۆ تەلەپاسی سەرکەوتنێکیشە بۆ تیۆرییەکەی کارل گۆستاف یونگ لە بارەی کۆنەستەوە (اللاشعور الجماعي) کە بریتییە لە خیبرەی لاشعووری هەموو خەڵك .

لەو وتارەیدا کە دوای مردنی بە ناوی (دەروون شیکاریو تەلەپاسییەوە) بلاوکراوەتەوە فرۆید دەڵێ « ئەگەر بهاتاو ژیانم سەرلەنوێ دەستی پێبکردایەتەوە خۆم تەرخان دەکرد بۆ لێکۆڵینەوەی گیانی نەك دەروون شیکاری» .

لەوە دەچێ نەست بەردەوام پەیامی تەلەپاسی وەربگرێ بەبێ ئاگای ئەقڵی هۆشیار بەلام تەنیا جارجار ئەم پایامە دیواری نێوان نەستو ئەقڵی هۆشیاری دەبڕێو پیاو هەستی پێدەکات . لەبەر ئەوە دەبێ بروسکەی تەلەپاسی لەکاتی خەونو خەواندنو هەلۆێستی دەروون شیکاریو کاتی حاڵو خەڵوەتدا زیاتر وەربگیریت . ڕەنگە هەر واش بێ ، نیکۆلاییێف کە دەیەوێ بروسکەیەکی تەلەپاسی وەربگرێ لەشی خاو دەکاتەوەو ئەقڵی بە هیچ شتێکەوە خەریك ناکات یان وەك بڵێین دەچێتە ژێری . خەونەکەی لۆمۆنۆسۆڤو زۆر خەونی تریش کەسانی تر دیوبانە لەبارەی نارەحەتی کەسانی خۆشەویستیانەوە ڕەنگە بەڵگەی ڕوودانی تەلەپاسی بن لە کاتی خەوندا .

لە ڕاستیدا هەندێ لێکۆڵەرەوە هەوڵیان داوە بروسکەی تەلەپاسی بۆکەسانی نوستوو بنێرن . لە یەکێ لەم تاقیکردنەوانەدا کاتێ کارۆگرافی مێشکی نوستووەکە دەری خست کابرا خەون دەبینێ لێکۆڵەرەوەکە کەوتە وردبوونەوە لە وێنەی Sacrament of the last supper بەو نیازەی وا لە نوستووەکە بکات خەونی پێوە ببینێ واتە بروسکەیەکی تەلەپاسیی لەبارەی ئەم وێنەیەوە بو بنێرێ . دوایی کە نوستووەکەی لەخەو هەستاند دەرکەوت خەونی بە کۆمەڵێك خەڵكو بەلەمێکی ماسیگرتنو پەرداخێ شەرابو نان خواردنەوە دیوە .

هەر لەم ڕوانگەیەوە هەندێ کەس لایان وایە زۆر خەونو هەلوەسەو ، گێلەو قسەکردنو نووسینی ئۆتۆماتێکی لە حاڵەتی ترانسدا trance (واتە حاڵەتی وەك حاڵ یان خەڵوەت کە پیاو لە دنیای دەوروبەری دادەبڕێ بەلام هۆشیاریشە) دەڵێن ڕەنگە ئەمانە بروسکەی تەلەپاسی نێرراوبن . دۆگلاس دینی زانای کیمیای ئەلەکترۆنی ئەمەریکایی دەڵێ ئەگەر زەلامێك بیر لە هاورێیەکی نزیکی بکاتەوە ئەوا گۆڕانێك لە پەستانی خوێنو قەوارەی خوێنی ئەو هاورێیەدا ڕوو دەدات واتە بیرلێکردنەوە دەبێتە هۆی گواستنەوەی بروسکەیەکی تەلەپاسی بۆ مێشکی هاوریکەی ، مێشکیشی کار لە کۆئەندامی سوورانی دەکات . هەندێ کەس زیاتر شووڵیان لێ هەڵ کێشاوەو دەڵێن زۆر پێدەچێ برێکی باش لە بیرو خەیاڵی ڕۆژانەمان بە تەواوی یان تا ڕادەیەك لە ڕێگەی تەلەپاسییەوە پێ بگاتو دوای ئەوەی لەکاتی برینی دیواری نێوان نەستو ئەقڵی هۆشیاردا تێکەلاوی ئەو بیرو خەیالانە دەبن کە بەرەسەن هی خۆمانن ، ئەوسا ئەوانیش بە هی خۆمان تێ دەگەین .

لە ڕوانگەی پەرەسەندنی بایۆلۆژیشەوە ڕەنگە تەلەپاسی جێگەی سەرنج بێ . تەلەپاسی ئەگەر هەبووبێ دیارە دەورێکی گرنگی بینیوە لە پەیوەندی بەستنی نێوان تاکەکانی هەمان جۆر گیانەوەرداو گیانەوەر توانیویەتی بە هۆیەوە هاواری فریاکەوتن بە هاورێکانی بگەیەنێ . ئالیستەر هاردی پرۆفیسۆری گیانەوەرزانی لەو باوەڕەدایە تەلەپاسی تەواوکەرێکی باشە بۆ تیۆری دارویینو دەڵێ ئەگەر پەیوەندییەکی لەو جۆرە لە نێوان ئەندامەکانی هەمان ڕەگەز گیانەوەردا هەبێ ئەوا ڕەنگە بتوانێ ببێتە هۆی هێشتنەوەو زاڵکردنی ئەو جینانەی کە بە باشترین شێوە لەگەڵ هەڵسوکەوتی گونجاوی گیانەوەرەکەدا دەگونجێن . چاوەڕێ دەکرێ تەلەپاسی لە گەڵ گەشەکردنی درەختی پەرەسەندندا بەرەو مرۆڤ کەم بوویێتەوە چونکە مرۆڤ بە هۆی بەدەستهێنانی زمانو ئەقڵی هۆشیاریو جۆرەها وەسیلەی دەسکردەوە پەیوەندییەکی باش بکات بەوانەوە کە دەیەوێ بۆیە ئەو وەسیلە سەرەتاییانەی وەك تەلەپاسی بەرەو پووکانەوە

چووە .

ئێستا لە ئەمەریکاو یەکێتی سۆڤیێت زانایان هەوڵ دەدەن توانای گیانەوەر بۆ گەیاندنو وەرگرتنی بروسکەی تەلەپاسی بەکار بێنن بۆ پەیوەستی (إتصال) بەستن لە نێوان ئێستگەی زەمینیو کەشتی ئاسمانیو ژێر دەریایی‌دا . سۆڤیێتی‌یەکان دایکە کەروێشکێکیان لە کەناری دەریا داناوەو ئەلەکترۆدیان چەقاندۆتە مێشکی بۆ تۆمارکردنی چالاکی کارەبایی مێشك . بەچکەکانیشیان برۆدتە ناو کەشتی‌یەکی قووڵایی دەریاوەو تاو نا تاوێك یەکێکیانیان کوشتووە . لە هەمان ساتی کوشتنی هەر بەچکەیەکدا شەپۆلەکانی مێشکی دایکەکە گۆڕانێکی کوتوپڕی بەسەردا هاتووە .

گەرچی هەبوونی تەلەپاسی وەك ڕاستی‌یەکی بینراوو لێکۆڵراوە چیتر جێگەی گومان نیە بەڵام هێشتا زانایان نەگەیشتوونەتە لێکدانەوەی چۆنێتی کارکردنو گواستنەوەی بروسکەی تەلەپاسی . لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین نکوولی لەوە بکەین کە تەلەپاسی دیاردەیەکی مادی‌یە یانی بریتی‌یە لە شێوەیەکی چالاکی مادە ، واتە چالاکی مێشك . بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە لە کاتی ڕوودانی تەلەپاسیدا مێشك گۆڕانی تایبەتی بەسەردادێ کە لەڕاستیدا هەر دەبێ ئەم گۆڕانانەش بن بنە هۆی ڕوودانی دیاردەی تەلەپاسیو گواستنەوەی لە مێشکێکەوە بۆ مێشکێکی‌تر کە ئامادەی وەرگرتنە .

لێونید ڤاسیلیێڤ دەروونزانی لینینگرادی هەوڵێکی زۆری داوە بۆ دیاریکردنی سروشتی تەلەپاسیو لە ئەنجامی زۆر تاقیکردنەوەدا بۆی دەرکەوت بروسکەی تەلەپاسی لەهەموو هەلومەرجێکدا دەگوێزرێتەوە ، تەنانەت لەو زرووفانەشدا کە ڕووناکیو دەنگو تیشکی ئێکسیو زۆربەی شەپۆلەکانی تری شەبەنگی کارۆموگناتیسیش ناگوێزرێنەوە ، واتە بروسکەی تەلەپاسی ناکەوێتە بواری هیچ کام لە شەپۆلە ناسراوەکانەوە . بەهەر حاڵ ئەمە مانای ئەوە نیە تەلەپاسی دیاردەیەکی فیزیایی نیە بەڵکوو دەشێ گواستنەوەی بروسکەی تەلەپاسی پشت بە تەنۆچکە وردی وەك نیوترینۆو شتی‌تر ببەستێ کە هێشتا نەدۆزراوەتەوەو تا کاتی دۆزینەوەی لێکدانەوەیەکی زانستیش نابێ خۆمان بدەین بەدەست غەیبو لێکدانەوەی نازانستی‌یەوە چونکە هەرچۆنێك بێ بۆچوونێکی زانستی‌یانە باجێگەی گومانیش‌بێ زیاتر جێگەی باوەڕو پشت‌پی‌بەستنە وەك لەوەی مەسەلەکە بدەیت بەدەست شتێکی لەخۆی نەزانراو ترەوە . وەك دەشزانین زۆربەی ئەو دیاردانەی ئێستا قوتابی سەرەتاییش لی‌یان دڵنیایە سەرەتا وەك تەلەپاسی نەزانراو بوونو چەندەها لێکدانەوەی زانستی و نازانستیان ئاڕاستە کراوە تا سەرەنجام بوون بە ڕاستی‌ی زانستی سەلمێنراو .

**فەرهەنگۆك**

تەلەپاسی : تناقل الأفكار Telepathy
بروسکەی تەلەپاس Telepathic Message
دوانەی هاویەك (ئەو دوانەیەی لەیەك هێلکەی پیتێنراو دروست دەبن Identical Twins
وەرەقەی زێنەر/ Zener cards
خاو بوونەوە إرتخاء /Relaxation
خۆبەسەربێتی عفوية /Spontaniety
پەیوەستی إتصال / Communication
ئیدراك الادراك /Perception
ئیدراکی دەرەستی /Extrasensory Perception
کارۆگراف مێشك تخطيط الدماغ الكهربائي /EEG
نەست لاشعور /The Unconcious
کۆنەست اللاشعور الجماعي / Collective Unconcious
خەواندن تنويم / Hypnosis
دەروونشیکار محلل نفسي/ Psychoanalyst
دەروونشیکاری تحليل نفسي/ Psychoanalysis
تاك الفرد / Individual
پەرەسەندن تطور / Evolution
ئەلەکترۆد قطب كهربائي / Electrode
تەنۆچکە جسيمه / Particle
شەبەنگی کارۆ/موگناتیسی / Electromagnetic Spectrum

**سەرچاوەکان**

1 – Lyall Watson , Supernature, London , 1974
2 – K. Platonov , Psychology as you may like it , Moscow , 1965.
3 – H, Eysenck , Sense and nonsense in Psychology London , 1961.

# ووزەی خۆر

## Solar Energy

ئەندازیار / بورهان ئیبراهیم یەعقوب
هەولێر

لەبەرەبەیانی مێژوودا مرۆڤ هەستی بەهێزی تیشکی خۆر کردوەو سودی لە ووزەی تیشکی خۆر وەرگرتوە بۆ ووشك کردنەوەی جل‌وبەرگ‌و بۆ پاراستن‌و ووشك کردنەوەی میوە ، وەهەروەها بۆ خۆپاراستن لەسەرماو سۆلەی زستان دەتوانین بڵێین خۆر سەرچاوەی ژیانی سەرزەمینە ، ئەگەر هاتو ئەو خۆرە نەبوایە بەو شێوەی ئێستای بوونی ژیانیش نەدەبوو .

ئەگەر چاوێك بە لاپەڕەکانی مێژوودا بخشێنین دەبینین هیچ نەتەوەیەك نیە سوودی لە ووزەی تیشکی خۆر وەرنەگرتبێ بەڵکو خۆر چووەتە پاڵ شتە پیرۆزەکان پایەو پلەیەکی بەرزیان داوەتێ‌و چووەتە پاڵ بیروڕا ئاینیەکان ، وەك گریکەکان کە تیشکی خۆریان بەکارهێناوە بۆ ڕۆشن کردنەوەی پەرستگەی «دلفی» لە یۆنان ، وەهەروەها ڕوداوە مێژوویەکان وادەگێڕنەوەو دەڵێن کەوا ئەرخەمیدس ئاوێنەی رووچاڵی بەکارهێناوە لە ساڵی ٢٨٧-٢١٢ پ .ز بۆ پەیت‌کردن‌و ئاراستەکردنی تیشکی خۆر دژی کەشتیە رۆمانیەکان کەوا هێرشیان هێناوەتە سەر دوورگەی «سیراکۆسا» وە بووەتە هۆی سوتاندنی کەشتیەکانیان ئەم کارە بەنرخەی ئەرخەمیدس بووەتە جێگەی سەرنج ڕاکێشانی زاناکانی هاوچەرخ ، وەسوودیان لەم کردەوەیە وەرگرت‌و کردیانە بناغەی داڕشتنی جۆرەها تیورو بنەما کە دەربارەی تیشك‌و تیشکی خۆر دانراوەو نووسراوەو لێ‌کۆڵراوەتەوە .

بەرەبەرە تاقی کردنەوەو تۆژینەوەی زانیاری دەستی پێ‌کرد بۆ گەیشتن بە نهێنییەکانی تیشکی خۆر ئەوەتا زانایەك بە ناوی (کاسێن) هێنری تیشکی خۆری بەکارهێنا بۆ تاواندنەوەی کانزاکان بەهۆی دروست کردنی کورەی خۆری لە ساڵی ١٨١٣-١٨٩٨ی زانییدا ، لە ساڵی ١٧٥٩ی زانییدا (هنری وود) داینەمۆیەکی دروست‌کرد کەوا بە هۆی هەوای گەرم ئیشی دەکرد ، لە ساڵی ١٨٧٨ی زانییدا زانایەك بەناوی (مۆشۆ) چاپخانەی دەوڵەتانی لە پاریس وەکارخست بەهۆی داینەمۆیەك کە بەووزەی خۆر ئیشی دەکرد .

بەرەبەرە زاناکان کەوتنە خۆ تەیاردان وە هەریەکە بەش بەحاڵی خۆیەوە دەستی‌کرد بەلێ‌کۆڵینەوەو تاقی‌کردنەوە دەربارەی بەکارهێنانی ووزەی تیشکی خۆر ، بەڵام تاوەکو ئێستا بە شێوەیەکی ئابووریانە نەتوانراوە ئەم ووزەیە وەکاربێخن‌و سوودی لێ‌وەربگرن ، بەڵام ئێستا زۆر دامودەزگای گەورە دامەزراوە بۆ دیراسەت کردن‌و تۆژینەوەی زانیاری دەربارەی ووزەی تیشکی خۆر ئەوەتا لە عێراق دەزگایەکی گەورە دامەزراوە بۆ ئەم مەبەستە ، بەناوی مەڵبەندی تۆژینەوەکانی ووزەی خۆر کەوا سەر بە ئەنجومەنی تۆژینەوەی زانیارییە ، کە زۆر تۆژینەوەی بە نرخیان بە ئەنجام گەیاندوە ، چەندین پسپۆڕی فیزیاو کیمیاو ئەندازیاری کاری لێ‌دەکەن .

**خۆر**

وەك دەزانین کە خۆر گەورەترین ئەستێرەیە لە کۆمەڵەی

خۆری‌دا کەوا سەرەرای خۆر «٩» نۆ ئەستێرەی دیکە هەیە وەهەریەك لە مانە مانگ‌و کۆمەڵە ئەستێرەی خۆی هەیە کە ئەمانەن .

زاوە – ناهی – زەمین – بارام – بیرجیس – کەیوان – ئورانوس – نبتۆن – بلۆتۆن .

هەروەها ووتمان خۆر لە هەموان گەورەترە ، بارستەکەی یەکسانە بە ١ر٩٨٦×$١٠^{٣}$ کیلۆگرام واتە ٣٣٣هەزار جار بەقەد بارستەی زەمین‌و ،، تیرەی خۆر ١ر٤ ملیۆن کیلۆمەترە وەقەوارەکەشی ١٤٠ر٦٣٩ر٥٠٧کم$^{٣}$ .

بارستەی خۆر بری‌تیە لە دوو چەشنەگاز ، گازی هایدرۆژین‌و گازی هیلیۆم ، لەگەڵ ڕێژەیەکی زۆر کەم لە گازەکانی‌تر وەك کاربۆن‌و نایترۆژین ، ڕێژەی گازی هیلیۆم ٩ر٥٪یە وە ڕێژەی گازی هایدرۆژین ٩٤٪ە .

هەروەك ووتمان بەشی هەرە زۆری بارستەی خۆر لە گازی هایدرۆژین پێك‌دێ ، وەبەشێوەیەکی بەردەوام لە ناو کرۆکی خۆردا کارلێکی نەپچراوە روودەدا ، وە لە ئەنجامی ئەو کارلێکانەدا گازی هیلیۆم دەردەچێ ، وە لە ئەنجامی تاقی‌کردنەوەدا دەرچووە کەوا بەبارستەی ٦×$١٠^{١١}$ کیلۆگرام لە هایدرۆژین دەگۆرێ‌و دەبێتە گازی هیلیۆم لە ماوەی یەك چرکەدا ، جا ئەگەر بێتو سەرنج بدەینە بارستەی خۆرو بەراوردێك بکەین دەبینین کەوا ئەم ووزەیە زۆر زۆرە بەشی هەزار ملیۆن ساڵ دەکا .

**«پیوانەکانی تیشکی خۆرو ئەو هۆیانەی کاری تی‌دەکەن»**

سورانەی گۆی زەوی لە دەوری خۆردا شێوەی هێلکەیی وەردەگرێ ، وەبەپی‌ی یاسای «نیوتن» ووزەی تیشك لەگەڵ دووجای ماوەی نێوان گۆی زەوی‌و خۆر دەگۆرێ‌و شێوەی هاوڕێژەی پێچەوانەیی وەردەگرێ جا لەبەر ئەوە ئەم ووزەیە بەردەوام لە گۆراندایەو لە هەموو کاتێك وەك یەك نیە ، وەبەگوێرەی ئەو پیوانانەی کەوا کراون ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ چوونکە لە ئەنجامی تاقی‌کردنەوەدا دۆزراوەتەوە کەوا نزیکترین دووری نێوان زەمین‌و خۆر لە –٣–ی کانوونی دووەمە دەکاتە ١ر٤٧×$١٠^{١٤}$ مەتر ، وە دوورترین دووریش نێوانیان کەوا لە ٥–ی‌تەمووزە دەکاتە ١ر٥٢×$١٠^{١١}$ مەتر ، وەناوەندی دووری دەکاتە ١ر٤٩×$١٠^{١١}$ مەتر .

ئەو چینەی کەوا بەرگی سەرەوەی خۆری داپۆشیوە سەرچاوەی سەرەکی تیشکی خۆرە کەوا پلەی گەرمایەکەی



دەکاتە –٦– هەزار پلەی سەدی .

وە بە پێی ئەم پیوانانەی کەوا کراون تێکرای ووزەی خور دەکاتە ٣٫٨٥×٢٣١٠ کیلۆ – وات ، بەلاّم ئەو ووزەیەی کەوا دەگاتە سەر رووی زەمین نزیکەی ١٫٨×١٠ $^{١٤}$ کیلۆ –واتە .

لەو کاتەی کەوا خۆر تیشك دەبەخشیّو پەرش و بلاّو دەبێتەوەو دەگاتە بەرگی کەش و سەرزەمین بەرەنگاری چەند کۆسپێك دەبێت و هەریەکەیان بەشێوەی تایبەتی خۆی بەشێکی لیّ هەلدەمژیّو لە تێکرای ووزەی کەم دەکاتەوە ، وەك ئەمانەی خوارەوە .

١ – **مشتن** :– هەر گازێك لە بۆشایی ئاسمانداو لە هەوادا بەشێك لەم تیشکە هەلّدەمژیّ .

٢ – **پەرش بوونەوە** :– مەبەست لە پەرش بوونەوە ، پەرت بوونەوەی تیشکی خۆر بە شێوەیەکی رەمەکی ، لە کاتێك کە تیشکی خۆر دەگاتە بەرگی کەش ، لەگەلّ گەردیلەکانی هەواو گەردیلەکانی هەلّمی ئاوو تەنۆکە ووردیلەکان بەیەکا دادێن و لە ئەنجامی ئەم بەیەکداچوونەدا تیشکی خۆر بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ بەربلاّودەبێتەوە بیّ ئەوەی کاربکاتە سەر درێژی شەپۆلەکانی شەبەنگی خۆر ، دوو جۆر لەم بەیەکداچوونەدا هەیە ، جۆری یەکەم ئەو گەردیلانەی کەوا تیرەکانیان کەمترە لە درێژی شەپۆلەکان وەك گەردیلەکانی هەواوو هەلّمی ئاو ، وەجۆری دووەم لەگەلّ ئەو گەردیلانەی کەوا تیرەکانیان گەورەترە لە درێژی شەپۆلەکان وەك ووردیلەکانی تۆز .

٣ – **پەرش بوونەوەی ئاوێنەدار** : تەنۆکە تۆزیەکان و دلۆپەکانی ئاوو بلوورەکانی بەفر ، ئەم جۆرە تەنانە هەلدەستن بە رەنگدانەوەی رووناکی وەبەشێوەیەکی یەکسانی ئاراستەو پەیتی دەکەن بیّ جیاوازی بۆ هەموو شەپۆلەکانی شەبەنگی خۆر ، وەئەو دیاردەیە بە چاوی خۆمان دەیبینن لەکاتێك کە دنیا تۆزاوی دەبیّو ئاسمان بەرەو سپیاتی دەروا .




٤ – **هەور** : هەوریش بەدەوری خۆی هەلدەستیّ بە مژینی رێژەیەکی دیارکراو لە تیشکی خۆر بەلاّم لە هەمان کاتدا بری زۆر گەورە رەنگدەداتەوە بە هۆی بەلوورەکانی بەفر بەتایبەتی ئەو هەورانەی لە بەرزایی ١٢–١٨کم دایە . کەواتە لێرەدا دوو جۆر لە هێزی تێشکی خۆرمان دەگاتیّ

١ – ئەو تیشکانەی کە دەگەنە سەر زەوی بیّ ئەوەی هیچ شتێکیان بەسەرا بێت ، پیّی دەلّێن پێکنەری راستەو خۆی تیشکی خۆر

٢ – ئەو بەشەی کەوا هێزەکانی سروشت کاری تیّدەکەن وەك ئەوەی لەسەرەوە باسمان کردن ، کە پیّی دەلّێن پێکنەری بەربلاوی تیشکی خۆرو بە هەردوو پێکنەرەکە دەلّێن تێکرای ووزەی تیشکی خۆر .

### پەیداکردنی ووزەی کارەبا بەگۆرینی گەرمە ووزەی تیشکی خۆر

پەیداکردنی کارەبا لە ووزەی تیشکی خۆر هیچ




هێلکێشی جوغزێکی کارەبایی بۆ گۆڕینی ڕاستەوخۆی تیشکی خۆر بۆپەیداکردنو داخون کردنی ووزەی کارەبا

جیاوازی‌یەکی ئەوتۆی نیە لەگەلْ سەرچاوەکانی دیکەدا تەنیا ئەوە نەبێ لێرەدا تیشکی خۆر شوێنی ئەو سەرچاوە گەرمی‌یە دەگرێتەوە کەوا لەئێستگەکانی دیکەی پەیداکردنی کارەبادا هەیە . واتە گەرمە ووزەی تیشکی خۆر لە جیاتی سووتەمەنی بەکاردێت وەهەروەها تەختەی -- خۆری بەکاردێت بۆ کۆکردنەوەو پەیت‌کردنی تیشکی خۆر .

ئێستگەی پەیداکردنی ووزەی کارەبا بەگەرما گۆڕکی‌ی ووزەی خۆر لەم بەشانەی خوارەوە پێك دێ

١ – تەختەکانیووزەی تیشکی‌خۆر
٢ – ئەمباری گەرمایی
٣ – تۆربینو پەیداکەرەوەی کارەبا
٤ – خەستکار – (چرێن)
٥ – پەمپ‌و چەند ئامێرو هاوپێچێکی‌تر

دوو ڕێگای سەرەکی هەیە بۆ کۆکردنەوەی ووزەی تیشکی خۆرو گۆڕینی بۆ گەرمە ووزە لە ئێستگەکانی پەیداکردنی کارەبا

**١ – پێشوازی چەقەگر Central Receiver**

ئەم سیستەمە لە کۆمەلێك ئاوێنەو رووی رەتکەر «رەنگدەر» پێك‌دێ کەوا توانای چوستی باشی هەیە بۆ رەتکردنەوەی تیشکی خۆر . وەئەم ئاوێنانەش بە شێوەیەك دادەندرێن کەوا تیشکی خۆر لە یەك خالْدا کۆبکەنەوە . لە سەرەوەی ئەو بورجە ئاسنینەی کەوا لە ناوەندی ئاوێنەکان راست‌کراوەتەوە . لەم شوێنەدا (کەوا لەم وێنەیەدا هێلکێش کراوە) ئاو کۆلێنێك دادەندرێت بۆ گەرم‌کردنی ئەو شلەیەی پیێ‌دا دەروا . بۆ بەرزکردنەوەی پلەی گەرمایی جالێرەدا دوو شێوە بەکاردێت شێوەی راستەوخۆ شێوەی ناراستەو خۆ ، ئەگەر بە شێوەیەکی راستەوخۆ بەکارهات ئەوا شلەکە (تراوەکە) دەرواو دەبێتە هەلْمو پلەی گەرمی بەرز دەبێتەوە دوایی بەرەو تۆربین دەروا لەوێشەوە یەکسەر بۆ خەستکار . دوایش دووبارە دەگەرێتەوە ئەو شوێنەی کەوا شلەکەی لێ هاتیتە کولاْندن . بەلاْم لە حالەتی بەکارهێنانی ناراستەوخۆ لەم حالەتەدا . ئەو جۆرە شلانە بەکاردێن کەوا پەستانیان زۆر بەرزە توانای بەرهەلْستی پلەی گەرمی‌یان هەیە بیێ‌ئەوەی ببن بەهەلْم ، لەپاشان شلە گەرم‌بووەکە لە ئەمباری گەرمی کۆدەبێتەوە . وەئەو ئەمبارە گەرما گۆڕکی‌یەکی تێدایە کەوا شلەیەکی دیکەی پیێ‌دادەرواو دەبێتە هەلْم . لە پلەیەکی نزمتر لەو شلەیەی کە لەئەمبارەکەدا هەیە ، وەلەئەنجامی گواستنەوەی گەرما لەو شلەیەی کە لە ئەمبارەکەدایە بۆ ئەو شلەیەی کە لە گەرما گۆڕکی‌یەکەدا ، ئەوەی ناو گەرماگۆڕکی‌یەکە دەبێتە هەلْمو پەستانی بەرز دەبێتەوەو بەرەو تۆربین هەلْدەکشیێ بۆ کارپیێ‌کردنو بەرهەم هێنانی ووزەی کارەبا لە داینەمۆیە کارەباییەکەدا .

**٢ – تەختەپەیت‌کەرە سەربەخۆکان**

**Dispersed — Concentrator**

ئەو سیستەمەش بری‌تیە لە کۆمەلێکی زۆر لە تەختەکانی

(الواح شمسيه) تيشكى خۆر كەوا رێژەى پەيتكردنێكى بەرزيان هەيە ، چونكە چوستى ئەم جۆرە ئێستگەيە متمانە نەسەر گەرمى سەرچاوەكە دەكات جالەبەر ئەوە برێكى زۆر لە تيشكى خۆر پەيت دەكەن‌و پلەى گەرميش دەگەيێنتە ئەو ئاستەى كە داوا كراوە ، چونكە ئەوشلەيەى كەوا بەكاردێت پلەى كولاندنى دەكاتە (٥٠٠) پلەى سەدى ، جاليرەدا هەرچەندە پلەى گەرمى سەرچاوەكە بەرزبێتەوە ئەوەندە چوستى ئێستگەكە بەرز دەبێتەوە .

لە ئێستگەكانى پەيداكردنى كارەبا لەگەرمە ووزەى تيشكى خۆر ، گازە ئۆرگانيەكان بەكار دەهێنرێت بۆ گەرم كردن‌و هەڵمێنى ئاو ، جا ئەم گازانە لەو كاتەى كەوا لە تۆربين دەردەچن كەمێك لەو ووزەيەى كەوا هەيانە وونى دەكەن وەبۆ سوود وەرگرتن لەم ووزە وونبووەدا چەند ئامێرێك زياد دەكرىَ لە پاڵ ئامێرو دامودەزگاكانى تر بۆ مەبەستى تر ، وەك سوود وەرگرتن بۆ بەكارخستن‌و ئيش پێكردنى سيستەمى ساردكردن‌و بۆ گەرم كردنى ئاو .

**پەيداكردنى كارەبا بەراستەوخۆ گۆرينى ووزەى تيشكى خۆر**

گۆرينى گەرمە ووزەى تيشكى خۆر بۆ پەيداكردنى كارەبا بەندە بە شانە هەتاويەكان (خانەى خۆرى) ، جا ئێستا با بزانين ئەو جۆرە خانانە چين‌و لە چ پێك دێن‌و چۆن كاردەكەن .

**شانەى هەتاو (خانەى خۆر) Solar Cell**

ئامرازێكە ووزەى تيشكى خۆر بەكاردێنێت بۆ پەيداكردنى كارەبا ، بۆ دروست كردن‌و ئامادەكردنى ئەو جۆرە خانانە چەند جۆرە توخمێك هەيە لەوانە لە هەموويان باشترو چالاكتر كەوا چوستى‌يەكى باشى هەيە ، توخمى (سليكۆنە)

توخمى سليكۆن توخمێكى كريستالى‌يە كەوا چەند توخمێكى ديكەى بۆ زياد دەكرىَ كە هەريەك لەمانە بارگەيەكى جياى هەيە ، بارگەى نيگەتيف‌و پۆزەتيف ($\bar{e}$ , $\bar{e}^+$) وە رووى پێشرەوى كەوا بەر تيشك دەكەوىَ بە جۆرە مادەيەك رووپۆش دەكرىَ پيىَ دەڵێن – Anti – Reflection بۆ ئەوەى تيشك رەت نەكاتەوە . لە كاتێك كەوا تيشكى خۆرى بەسەردا دەكەوىَ ، ئەو تيشكانە هەڵدەستن بە روودانى ئايۆن بوونى گەرديلەكان ، جا ئەگەر بێتو ووزەى تيشك گەورەتر بوو لە ووزەى بەستنى ئەليكترۆنەكان بەگەرديلەكان ئەوا كۆمەلە ئەليكترۆنێك رزگار دەبن وەلەئەنجامى ئەم كردارەدا جووتىَ لە (ئەليكترۆن – كەلێن (فجوة)] پەيدا دەبێت وەلەئەنجامى ئەم چەندو چوونەدا هێزى جولەى كارەبا پەيدا دەبێت .

ئەليكترۆنە رزگاركراوەكان بارگەى نيگەتيف ($\bar{e}$) هەڵدەگرن وەكەلێنەكانيش بارگەى پۆزەتيف ، ئەگەر هەردوو جەمسەرەكە (پۆلەكە) بەتەلێكى گەيەنەر ببەسترێت ئەوا دەبێتە هۆى رۆينى تەزووى كارەبا .

هەروەك لەم وێنەيەدا دياركراوە چۆن شانەى هەتاو بەكاردەهێنرێت بۆ پەيداكردنى كارەبا وەلەهەمان كاتدا بۆ داخون كردنى ئەم ووزەيە كۆمەلە پاترى‌يەك بەكاردێت ، وەهەروەها جارى واهەيە پێويستمان بەتەزووى لەراوە دەبێت ، جا بۆ گۆرين‌و بەكارهێنانى ئەم تەزووە جۆرە ئامێرێك لەگەڵ ئەم سيستەمە دەلكێنرێت وەك (INVERTER) يان گۆرەر (TRANSFORMER) وەبۆ ئەوەى كۆنترۆل بكەينە سەر حالەتێك كەوا شانە هەتاوى‌يەكان لەكاركردن دەكەون ، سەرچاوەيەكى ترى كارەبا لە ئێستگەكە دەبەسترێت بەنەكوژرانەوەى سيستەمەكە .

سەرەراى چوستى‌و چالاكى شانەهەتاوى‌يەكان هەندىَ هۆ هەيە كەوا كاردەكەنە سەر خاسيەت‌و چوستى لێرەدا هەندىَ لەو هۆيانە نيشان دەكەين .

١ – پەيوەندى نێوان ووزەى فۆتۆنەكانى رووناكى‌و ووزەى بەستنى ئەليكترۆنەكان بەگەرديلەكان ، جا ووزەى بەستن لە توخمێكەوە بۆ توخمێكى‌تر دەگۆرىَ بەلاَم بەشى زۆرى ئەو توخمانە كەوا بەكاردێن ووزەى بەستنيان لە نێوان ١ر١–٣ر٢ ئەليكترۆن – ڤۆلتە (ev) بۆ نموونە ووزەى بەستنى ئەليكترۆن – گەرديلە – لە توخمى سليكۆن (١ر١ ev)تە .

٢ – وەیان دەبینین ئەو تیشکە ووزانەی کەوا بەسەر رووی سەرەوەی شانەکانی خۆر دەکەون ، بەشێك لەو ووزەیە وون دەبێ‌و بەشێوەی گەرمی بەهەوادا پەرت دەبێ ، چوونکە هەندێ لەو ئەلیکترۆنانە توانای دەربازبونیان نامێنێ‌و دەگەرێنەوە ناو کرۆکی توخمەکە وەلەئەنجامی ئەم کردارەدا جوولە ووزەی ئەلیکترۆن پەیدا دەبێ‌و بەشێوەی گەرمی دەری دەکا .

٣ – وەهەندێ سەرچاوەی دیکە هەیە دەبێتە هۆی وون‌بوون‌و بەفیرۆ چوونی ووزە لەوانە ، لەبەرگری‌یە کارەبای‌یەکاندا ، یان گەرانەوەی هەندێ لەو ئەلیکترۆنانە کەوا لەگەڵ کەلێنەکان یەکتر دەگرنەوە ، یان لە جوغزە کارەبای‌یەکانی دەرەوە لە ئامێرەکانی ئالوگۆری تەزووی کارەبا ، ئەم هۆیانە تێکرای چووستی‌و چالاکی شانە هەتاوی‌یەکان کەم دەکەنەوە .

**کێشەکانی سوود وەرگرتن لە ووزەی تیشکی خۆر**

١ – بۆ کۆکردنەوەو پەیت کردنی تیشکی خۆرو سوود وەرگرتن لەم ووزەیە چەند ئاوێنەیەکی رووچاڵ دێنین کەوا هەڵدەستن بە کرداری کۆکردنەوەو پەیت‌کردن ، جا ئەگەر بێتو برێکی زۆر وەبەرهەم بێنین ئەوە رووبەرێکی زۆرمان پێویستە

٢ – وەکێشەیەکی دیکەش هەیە ئەویش کێشەی داخون کردنی ئەم ووزەیەیە ، ئایا ئەمباری واهەیە کە توانای هەبێت ئەو ووزەیە داخون‌بکات ، هەڵبەت دەبێ ئەمباری تایبەتی ئامادەبکرێت ، بەڵام تارادەیەك دەتواندرێ بەشێك لەم ووزەیە داخون‌بکرێت ئەویش لەوکاتەی کەوا ووزەی تیشکی خۆر بەکار دێت بۆ پەیدا کردنی ووزەی کارەبا یەکسەر بە تۆرێکی کارەبا دەبەسترێت دوایش دابەش دەکرێت

٣ – هەروەها شوێنی جوگرافی دەورێکی کاریگەر دەگێرێت لەپەیدا کردنی بری ئەو ووزەیە ، ئەگەرهاتو دنیا بێ‌گەردو ساماڵ بوو ئەوا ووزەیەکی زۆر وەبەرهەم‌دێ ، وەئەو شوێنانەی کەدەکەونە نزیك هێڵی یەکسانی‌و نیوهێڵی پانی (٤٠°) بوارێکی باشیان هەیە ، یان بەشێوەیەکی تر بڵێین حالەتی خۆر ، بەگوێرەی سوری گوێزەوی (مەبەست لە گۆشەی لێدان) کارێکی گەورە دەکاتە سەر بری تیشکە وەرگیراوەکان لەهەر شوێنێك لەسەر رووی زەمین جا لێرەدا کات دەورێکی گرنگ‌و کاریگەر دەگێرێ لە زۆری‌و کەمی ئەم ووزەیە ، دەبینین لە نیوەرۆیاندا توانای بوون‌و وەرگرتنی ووزەیەکی زۆر هەیە چونکە ئەو تیشکانە بە شێوەیەکی ستونی دەکەونە سەر زەمین‌و ماوەیەکی زۆر کورت دەبرن ، بەڵام هەر ئەو ماوەیە دوورو درێژ دەبێتەوە لە کاتی سبەینان‌و ئێواران چوونکە گۆشەی لێدان دەگۆرێ‌و تیشکەکانیش بەرەنگاری پەرش بوونەوەو شکاندن‌و مژین دەبن لەرێگادا .

**فەرهەنگۆك**

زاوە / عطارد
ناهی / زهرە
بارام / مریخ
بیرجیس / مشتری
کەیوان / زحل
کەلێن فجوە / Gap
تەختە لوح / Panel
گۆشەی لێدان / زاویە السقوط
ئەلیکترۆن – ڤۆلت ev : / یەکەی پێوانی ووزەیە
شەبەنگی خۆر / الطیف الشمسی
کیلۆوات = یەکەی پێوانی هێز = یەکەی پێوانی توانای کارەبایی
شانە هەتاویان (شانەتاو) = الخلیة الشمسیة

**سەرچاوەکان**


١ – تکنولوجیا الطاقة البدیلة . د. سعود یوسف عیاش .
سلسلة عالم المعرفة رقم ٣٨ – شباط ١٩٨١م – الکویت
٢ – الافاق العلمیة لاستثمار الطاقة الشمسیة
الدکتور المهندس نورالدین عبدالله الربیعی
الجمهوریة العراقیة – وزارة الثقافة والاعلام – دائرة الشؤون الثقافیة والنشر ١٩٨٣ – السلسلة العلمیة رقم ٢١
٣ – حافظ قبیسی . الطاقة الشمسیة (سلسلة العلوم المتکاملة – ٥) بیروت – ١٩٧٨
٤ – مجلة العلوم – العدد الرابع – السنة الاولی – تشرین الثانی ١٩٨٤ تصدرها دائرة الرقابة العامة – وزارة الثقافة والاعلام الجمهوریة العراقیة
٥ – مجلة المهندسون – العدد الاول – السنة الاولی – شباط ١٩٨٥ مجلة شهریة تصدرها نقابة المهندسین العراقیین – بغداد .



Milky way galaxy

# دورگەکانی ئاسمان

ئەندازیار : سالار أحمد فتاح
كركوك

گەر لەشەویکی تاریکی سافو سامالدا تەماشایەکی ئاسمان بکەیت ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی زۆر چڕ دەبینیت ، کە بەشێوەی پشتێنەیەکی سپی لە ئاسۆوە بۆ ئاسۆ کشاوە . . لە ناو کوردەواری خۆماندا بەم پشتێنە سپی‌یە دەڵێن (ڕێی کاکێشان)[1] ، کە هەر دەڵێی تارایەکی نەخشینو گەوهەربەندە بەڕووی ئاسماندا دراوە . ئەمڕۆش لە ئەستێرەناسیدا بەم کۆمەڵە ئەستێرەیە دەووترێت (مەجەرەی ڕێی کاکێشان)[2] . Milky Way Galaxy

مەجەرەش Galaxy دورگەی گەردوونی زۆر مەزنەو یەکەی بنەڕەتی‌یە لە پیکهاتنی بۆ شایی پانوبەرینی ئاسمانداو بەژمێرەکاریو یاسای ووردو ڕێك‌وپێك لە دەریای بێ‌سەروبنی بۆشاییدا پەرش‌وبلاوە . . هەر مەجەرەیەك هەزارەها ملیۆن تەنی ئاسمانی جۆراوجۆر بەشداری دەکەن لەپێکهاتنیدا وەك :

هەوری تۆزو گازی گەردوونی Gas cloud ، سەدیم Nebulae[3] ، ئەستێرە Star ، هەسار Planet[4] ، کلکدار Comet[5] ، نەیزەك (ئەستێرەی‌کشاو)و Meteor[6] ، کایەی کارەبایی موگناتیسی بەهێز . .

لەئاسمانی بینراودا – بەگوێرەی دوا پشکنینی ئەستێرەناسی – یەك ملیۆن ملیۆن مەجەرە هەیە ، تێکڕا هەر مەجەرەیەکیش لەم مەجەرانە سەد هەزار ملیۆن ئەستێرەی جۆراوجۆری زیاتر تێدایە ، لە نێو ئەم ئەستێرانەش ، هی ئەوتۆیان تێدایە کە ملیۆن ئەوەندی زەوی خۆمان دەبێت . . باشە ئەمە دەبێت چ مەزنی‌و چ شکۆدارييەك بێت ، کە ملیۆنەها ملیۆن تەنی سەیر سەیرو




١ – هێڵکاریەك قۆناغەکانی پەرەسەندنی مەجەرە نیشاندەدات . لە شێوەی نارێکەوە بۆ لوولپێچی . ئینجا هێلکەیی . .

جۆراوجۆر بەو ڕێك‌وپێکی‌و جوانی‌یە لەم گەردوونە مەزنەدا هەڵدەسوورێت‌و بەڕێوە دەچێت . . لە ڕاستیدا ئەمانە کاروباری ئەوتۆن کە بیروژیری لە ئاستیاندا سەرسام‌و واق ورماو دەمێنێت . .

**پەیدابوون‌و دروست‌بوونی مەجەرەکان**

کانگاو سەرچاوەی مەجەرەکان بریتی‌یە لە هەوری مەزنی تۆزوگازی گەردوونی کە بەزۆری پێکهاتووە لە گازی هایدرۆجین ، هەر ئەم هەورانەش هەوێنی پێکهاتنی ئەستێرەکانن . . بەتێپەڕبوونی هەزارەها ملیۆن ساڵ ، لەم هەورە پەرش‌و بڵاوانەوە ، بارستەی گازی جوێ دەبێتەوەو ئەو ئەستێرانەی لێ دروست دەبێت کە بەردی بناغەی پێکهاتنی مەجەرەکانن . بەدەرکەوتنی ئەستێرەکان ، مەجەرەش دەست‌دەکات بەدەرکەوتن‌و بەتێپەڕبوونی ملیۆنەها ساڵی‌تر ، ئەو ئەستێرانەی دروست‌بوونە گەورە دەبن‌و پیر دەبن ، لە هەمان کاتیشدا ئەستێرەی تازە بەردەوام دروست دەبێت لەو ماددە گازی‌یەی کە لە سەرانسەری مەجەرەکەدا بڵاوە ، بەم چەشنە مەجەرە پەرەدەسێنێت‌و دەبێتە مەجەرەیەکی لوولپێچ‌و قۆڵی پێچ خواردووی دەبێت . جابەبەردەدام بوونی دروست بوونی ئەستێرەی تازە ، ڕێژەی گازی گەردوونی لە مەجەرەدا کەم دەبێتەوە تادەگاتە ١٠٪ی ڕێژەی بنەڕەتی . مەجەرەش هەرگیز ئەم ماددە گازی‌یەی لێ‌نابڕێت تەنها لە کۆتایی تەمەنی دوورودرێژیدا کە ڕەنگە ١٥ هەزار ملیۆن ساڵ زیاتر بخایەنێت ، چونکە پاشماوەی ئەستێرە مردووەکان – کەدەتەقنەوە . چاکترین سەرچاوەن بۆ مەجەرەکان .

**پۆلەکانی مەجەرە**

مەجەرەکان بەگوێرەی شێوەو سیمای ڕووکەشییان دەکرێنە سێ کۆمەڵەی سەرەکییەوە ، کە ڕەنگە هەر ئەم سێ شێوەیەش هەنگاوە سەرەکییەکانی پەرەسەندنی گشت مەجەرەکانی گەردوون بنوێنن :

**(١) مەجەرە لوولپێچەکان (S,S) Spiral** . کە نزیکەی ٧٨٪ی مەجەرە ناسراوەکانی ئاسمان پێك دەهێنن ، بەشێوەی گێژەڵووکەی ئاگرینی زۆر مەزن لە ئاسماندا دەردەکەون ، ئەمانیش دوو جۆرن : قوباو elleptical‌و گۆیی globular . ئەم مەجەرانە بەبوونی ناووکێکی پرشنگدار لەناوجەرگەی خەپلەی مەجەرەکە جیادەکرێنەوە ، کە پڕە لە گازی گەردوونی‌و هەوری چڕو ئەستێرەی جێگیری پێگەیشتوو ، لە گشت لاکانیشیەوە قۆڵی لوولپێچی پێوە بەندن‌و دەورەی دەدەن .

ئەم قۆڵانەش لە گازو گەردو تۆزی گەردوونی پێکهاتوون و پڕن لە ئەستێرەی زەبەلاحی شین ، کەزۆربەیان لە دۆخی پێکهاتن‌و دروست بووندان . کەچی ئەستێرە زەبەلاحە سوورەکان گرگنەزەبەلاحە سوورەکان‌و Red Giants [7] گرگنە سپییەکان‌و white dwarfs [8] هەندێك لە ئەستێرە گۆڕاوەکان Variable stars [9] لەناووکی چڕی مەجەرەدا جێگردەبن .

دەبێت ئەوەش بزانین کە ئەم جۆرە مەجەرانە ، هەرچەندە سەربەیەك پۆل‌و کۆمەڵن ، بەڵام هەرگیز دوو مەجەرە نابینرێت هاوشێوەبن‌و لێك بچن ، بەڵکو هەر مەجەرەیەك سیماو ڕوخسارو نەقشی تایبەتی خۆی هەیە ، بگرە هەر هەمان مەجەرە – بەتێپەڕبوونی کات – شێوەی جیاجیا وەردەگرێت .

مەجەرەی ڕێی کاکێشانیش –کە تێیدا دەژین‌و کە ٢٠٠ ملیار ئەستێرەی تێدایە . لەپۆلی‌مەجەرەلوولپێچەکانە .

**(۲) – مەجەرە هێلکەیی‌یەکان (E,s) E.. ical**

ئەمانیش نزیکەی ۱۷٪ی ناسراوەکانی ئاسمان پێك دەهێنن‌و لە ئاسماندا وەك تۆپی مەزنی بریقەدار دەردەکەون‌و لەمەجەرە لوولپێچەکان ئارامترن ، چونکە لە ماوەی هەزارەها ملیۆن ساڵەی تەمەنیدا ، گازی گەردوونی لێ‌براوە . کەواتە ئەم مەجەرانە بەساڵاچوون‌و ئەستێرەکانیشی بەزۆری لەناوجەرگەیدا کۆدەبنەوەو وەك گشت مەجەرەکانی‌تر شێوەی جیا جیا وەردەگرن . لەنموونەی ئەم مەجەرانە مەجەرەی M89 .

**(۳) – مەجەرە نارێکەکان (Irr, s) Irregular**

ئەم مەجەرانەش ۳٪ی مەجەرەکانی ئاسمان کەمترن . . نابێت لە ناوی ئەم مەجەرانە ئەوە تێبگەین کە نیزام‌و پێرەوی دیاری‌کراویان نییە ، بەڵکو هەرچی یاسایەك حوکمی گەردوون بکات ، بەسەر ئەمانیشدا دەسەپێت ، بەڵام ئەوەندەیە کە شێوەیەکی ئەندازەیی دیاری‌کراویان نییە کە پێیان بناسرێنەوە ، بۆیە ئەم ناوەیان لێ‌نراوە . . ئەم مەجەرانە برێکی زۆری گازی گەردوونی تێدایەو ئەستێرەکانیشی لە ئەستێرە شینە تازەکان‌و شینە سپی باوەکانن .

لە نموونەی ئەم جۆرە مەجەرانە ، مەجەرەی M82و هەورە ماجەلانی گەورەو بچووکە Magellanic clouds . هەوری ماجەلانی گەورەو بچووکیش دوومەجەرەی بچووکی سەر بەمەجەرەی ڕێی‌کاکێشانن ، تیرەیان ، ۳۲ هەزارو ۲۶هەزار ساڵی ڕووناکی‌یەو[۱۰] گەورەکەیان ۱٦۰ هەزار ساڵ‌و بچووکەکەشیان ۱۸۰هەزار ساڵی ڕووناکی دوورە .

**مەجەرە سەیرەکان :**

لە قووڵایی بۆشاییدا ، مەجەرەی‌ترهەن ، جگە لەوانەی پێشوو کە باسمان‌کردن ، ئەم مەجەرانە ژیانێکی سەیر دەژین کە تەواو جیاوازە لە ژیانی سروشتی مەجەرە ئاساییەکان‌و وەك پەروکۆیکی پینەکراو بەرچاودەکەون .

بۆنموونە دوو مەجەرەی NGC 3190, NGC 3187 کە بەدەوری یەکتردا دەسوورێنەوەو هەریەکەیان ئەستێرەو ماددەی




**۲ – پانەبڕگەو تەنیشتەبڕگەی مەجەرەی ڕێی‌کاکێشان Miiky Way Galaxy شوێنی کۆمەڵەی خۆری تێدا دەردەکەوێت . .**

ئەستێرەیی لەوی‌تریانەوە دەکێشێت هەروەها مەجەرەی M87کە کلپە ئاگری ئەوتۆ فڕێ دەدات درێژییان ئەوەندەی درێژی چەند مەجەرەیەك دەبێت .

**مەجەرەکەمان (مەجەرەی ڕێی‌کاکێشان) Milky Way Galaxy**

مەجەرەکەمان مەجەرەیەکی لوولپێچی‌یە ، تەمەنی (۱۰–۱۵) هەزار ملیۆن ساڵە ! ! لە خەپلەیەکی مەزن لە ئەستێرەو هەوری گازو تۆزی گەردوونی پێکهاتووە . لە دەوری ئەم خەپلەیەش‌دا ، دوو قۆڵی لوولپێچی لە هەردوولای درێژدەبنەوە . . ئەستووری خەپلەی ناوەندی ۱۰هەزار ساڵی ڕووناکی‌یە ، تیرەکەشی سەرانسەر ۱۰۰ هەزار ساڵی ڕووناکی‌یە ، جا ئەگەر بێتو بتوانین گەشتێك بەم مەجەرەیەدا بکەین ، بەروکێتێك کە خێرایی‌یەکەی ۱۰هەزار کیلۆمەتر بێت لە سەعاتێکدا ، ئەوا ئەم گەشتەمان لەپەرێکی مەجەرەکەوە بۆ پەرەکەی‌تری تەنها ۱۵ ملیارو ۸۰۰ ملیۆن ساڵ دەخایەنێت‌و هیچی‌تر . . ! !

مەجەرەی ڕێی کاکێشان ۲۰۰ملیار ئەستێرەی جۆراوجۆری تێدایە ، کە خۆرەکەی خۆمان تەنها دانەیەکیەتی . ئەمەو جگە لە کلکدارو نەیزەك‌و هەسارو کوازارو[۱۱] Qusat پولسارو[۱۲] Pulsar کەلێنی ڕەش‌و Black hole[۱۳] کەلێنی سپی‌و گازو ئەتۆمی بێ‌شومار . .

له مه‌جه‌ره‌ی ڕێی کاکێشاندا ئه‌ستێره‌هه‌ن به‌زه‌به‌لاحی سوورو زه‌به‌لاحی شین ناسراون ، زه‌به‌لاحه سووره‌کان به‌زۆری له چه‌قو ناوجه‌رگه‌یدا کۆبوونه‌ته‌وه .

کۆمه‌ڵه‌ی خۆر – له‌گه‌ڵ نۆ هه‌ساره‌که‌یدا – ده‌که‌وێته یه‌کێك له قۆڵه لوولپێچه‌کانی‌و له دووری ٢٦هه‌زار ساڵی ڕووناکی له چه‌قی مه‌جه‌ره‌وه .

بێگومان گشت ئه‌ستێره‌کانی مه‌جه‌ره ، که‌ژماره‌یان ده‌گاته ٢٠٠ هه‌زار ملیۆن ئه‌ستێره ، له سوورانه‌وه‌یه‌کی به‌رده‌وامدان به‌ده‌وری چه‌قی مه‌جه‌ره‌دا . هه‌رچه‌نده له چه‌قیش دووربکه‌وینه‌وه ، خێرایی سوورانه‌وه‌ی ئه‌ستێره‌کان که‌متر ده‌بێته‌وه ، خۆرو کۆمه‌ڵه‌ی خۆریش – که‌زه‌وه‌ی یه‌کێکه له ئه‌ندامه‌کانی – به‌خێرایی ٢٨٠ کیلۆمه‌تر له چرکه‌یه‌کدا به‌ده‌وری چه‌قی مه‌جه‌ره‌دا ده‌سووڕێته‌وه . هه‌موو به‌کۆمه‌ڵ ئه‌م گه‌شته به ٢٢٥ملیۆن ساڵ ته‌واوده‌که‌ن ، به‌م ماوه‌کاتییه‌ش ده‌ووترێت (ساڵی گه‌ردوونی) .

شێوه‌ی مه‌جه‌ره‌که‌مان وه‌ك ووتمان لوولپێچی‌یه گه‌ر له‌سه‌ره‌وه ته‌ماشا بکرێت ، به‌ڵام گه‌ر له‌لاوه ته‌ماشا بکرێت خه‌پله‌یی‌یه وه‌ك ده‌نکه نیسك .

که‌واته نیزام‌و پێڕه‌وی سه‌رسوڕهێنه‌ری مه‌جه‌ره‌کان به‌شێوه‌یه‌کی ئه‌وتۆ ڕێکخراوه که ئه‌م ژماره بێشوماره‌ی ئه‌ستێرانه ، هه‌ریه‌که به‌ده‌وری ته‌وه‌ری تایبه‌تی خۆیدا بسووڕێته‌وه‌و هه‌ساره‌کانیشی به‌ده‌وردا بسووڕێنه‌وه‌و ئینجا به کۆمه‌ڵ به ده‌وری چه‌قێکی دیاریکراو به‌بێ وه‌ستان بسووڕێنه‌وه ! !

## په‌ره‌سه‌ندنی مه‌جه‌ره‌کان

مه‌جه‌ره ناڕێکه‌کان یه‌که‌م هه‌نگاون له پێکهاتنی مه‌جه‌ره‌کاندا ، که ئه‌میش له هه‌وری گازی مه‌زنه‌وه ده‌ستپێ ده‌کات ، که پڕه له شڵه‌ژانی گازو گێژه‌لووکه‌ی ئاگرینی مه‌زن . ئه‌م هه‌وره هێواش هێواش ده‌ست ده‌کات به‌چڕبوونه‌وه له هه‌ندێك به‌شیداو ئه‌ستێره تازه‌کان پێك‌ده‌هێنێت . ئه‌م ئه‌ستێرانه – به‌تێپه‌ڕبوونی ملیۆنه‌ها ساڵ – په‌ره‌ده‌سێنێت‌و ده‌بێته مه‌جه‌ره‌یه‌کی لوولپێچی هێزی سوورانه‌وه‌و کێش‌کردن ، ئه‌م هه‌وره گازییه گه‌ورانه ده‌گۆڕێت بۆ قۆڵی لوولپێچی . مه‌جه‌ره‌ی‌لوولپێچی Spiral ga laxy مه‌جه‌ره‌یه‌که له‌وپه‌ڕی چالاکی‌و توندوتۆڵیدا ، بۆیه قۆناغی لاوێتی ده‌نوێنێت له ژیانی مه‌جه‌ره‌دا . .

پاش تێپه‌ڕبوونی ملیۆنه‌ها ساڵ‌و پاش ئه‌وه‌ی سه‌ده‌ها هه‌زار ئه‌ستێره‌ی جۆراوجۆر دروست ده‌بێت ، بڕی گازی گه‌ردوو نی (هیدرۆجین) تۆزی گه‌ردوونی که‌م ده‌بێته‌وه له‌ته‌وه‌ره‌ی مه‌جه‌ره لولپیچه‌که‌دا ، به‌م چه‌شنه گه‌ردو گازه‌کان په‌یتا په‌یتا له قۆڵه لوولپێچه‌کانه‌وه به‌ره‌و ناوجه‌رگه‌ی مه‌جه‌ره‌که ده‌پێچرێنه‌وه . جا به‌نه‌مانی گه‌ردو گازی گه‌ردوونی له مه‌جه‌ره‌که‌داو به‌نه‌مانی قۆڵه لوولپێچه‌کانی ، مه‌جه‌ره‌که ده‌بێته مه‌جه‌ره‌یه‌کی هێلکه‌یی Elleptioal galaxyکه دوا هه‌نگاوه له‌په‌ره‌سه‌ندنی مه‌جه‌ره‌کاندا .

که‌واته مه‌جه‌ره‌کانیش ، وه‌ك هه‌موو شتێك له‌م بوونه‌وه‌ره مه‌زنه‌دا ، ژیانی به‌چه‌ند هه‌نگاوو قۆناغێکدا ڕه‌ت ده‌بێت ، له هه‌نگاوی کۆرپه‌له‌و ساوایه‌تی بۆ گه‌نجی‌و لاوێتی ، پاشان بۆ پیریتی‌و ئینجا مردن‌و نه‌مان . . گشت ئه‌م هه‌نگاوانه‌ش که باسمان‌کردن نزیکه‌ی ١٥هه‌زار ملیۆن ساڵ ده‌خایه‌نێت ! !

## خێرایی مه‌جه‌ره‌کان

مه‌جه‌ره‌ش وه‌ك مانگ ، وزه‌وی ، خۆرو ئه‌ستێره‌کان . . به‌ده‌وری ته‌وه‌ره‌یه‌کی دیاریکراودا ده‌سووڕێته‌وه ، به‌خێرایی‌یه‌کی بێشومار که ڕه‌نگه بگاته نۆ له‌ده‌ی خێرایی ڕووناکی – خێرایی ڕووناکی ٣٠٠هه‌زار کیلۆمه‌تره له چرکه‌یه‌کدا – ! !

گه‌ر خێرایی مه‌جه‌ره‌ش بگاته خێرایی ڕووناکی ئه‌وا لادانی دۆپله‌ری Doppler shift (١٤) تیشکه‌که‌ی له ڕوانگه‌کانی زه‌ویدا نابینرێت ، چونکه (کات) به‌گوێره‌ی ئه‌و ئه‌ستێره‌یه ده‌وه‌ستێت‌و ده‌چێته جیهانی (بێکات)ه‌وه . . ئه‌مه‌ش

ابەتێکە ، ئێرە جێی باسکردنی نی یە ! !

سەرەڕای ئەوەی مەجەرەکان بەم خێراییە مەزنانە دەسووڕێنەوە ، کەچی بە سەدەها ملیۆن ساڵ ئینجا یەك سوڕێك بە دەوری خۆیدا تەواو دەکات . جا لەمەوە مەزنیو پانو بەرینی گەردوون تەسەووربکە ! !

دەشێت ئەستێرە یامەجەرەیەك لە ئاسماندا ببینینو خۆشی لە ڕاستیدا نەمابێتو فەوتابێت ، بۆ نموونە ئەستێرەی Alpha Centauri کەنزیکترین ئەستێرەیە لە خۆرەوەو کەتەنها ٤ر٤ساڵی ڕووناکی ، واتا ٣٠٠ هەزار ئەوەندی دووری نێوان خۆرو زەوی لێمانەوە دوورە ، ئەو تیشکەی کە ئێستا بۆ ئەم ئەستێرەیەی دەبینین ، هی کاتی ئێستای نیە ، بەڵکو هی ٤و٤ ساڵ لەمە پێشەو ئێستا بە ئێمە گەیشتووە . لەپاش ئەوەی ئەو تیشکەدووری٤٤ملیۆنملیۆنکیلۆمەتری بەخێرایی ڕووناکی بریوە ، بۆ ئەم مەبەستەش ماوەی ٤ر٤ساڵی خایاندووە تا بەچاوی ئێمە گەیشتووە . جا دەشێت لەم ساتەدا ئەو ئەستێرەیە تەقیبێتو لە ئاسماندا نەمابێت . . گەر شتێکی ئاوهاش ڕوویدابێت ، ئەوا هیچکەسێك بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت ببینێت یاتێبینی بکات . . تەنها پاش چوار ساڵو نیوی تر ئینجا دەتوانین ئەم ڕووداوە ببینینو هەستی پێبکەین ! ! .

مەجەرەی ژنی پێوەندکراویش Andromeda نزیکترین مەجەرەی ئاسمانە لێمانەوە . نزیکەی دوو ملیۆن ساڵی ڕووناکی دوورە ، جا ئێستا ئەو تیشکەی دەبینین کە دووملیۆن ساڵ لەمەوبەر ڕەوانەی کردووە نەك هی کاتی ئێستای .

کوازار 3C273 کە ١٢ هەزار ملیۆن ساڵی ڕووناکی دوورە (واتا ١٢٠ هەزار ملیۆن ملیۆن ملیۆن کم) ئەو ڕوناکی یەی دەبینین کە ١٢هەزار ملیون ساڵ لەمە پێش لێوەی دەرچووە . ئەی گوایە دەبێت ئێستا چی بێتو چی بەسەردا هاتبێت ، پاش چەند هەزار ملیۆن ساڵە ! ! ؟



المرأة المسلسلة

٣ – دیمەنی مەجەرەی ئەندرۆمیدا Andromeda Galaxy ، کە نزیکترین مەجەرەیە لێمانەوەو (٢ر٢) ملیۆن ساڵی ڕووناکی (واتا نزیکەی بیست ملیۆن ملیۆن ملیۆن کیلۆمەتر دوورە . . ئەم مەجەرەیە لە پۆلی مەجەرە لوولپێچەکانە .

ئێمەش پاش تێپەڕبوونی ئەوەندە هەزار ملیۆن ساڵە ، ئینجا دەتوانین بزانین چی بەسەردا هاتووەباشە ئەیدەشێت سەرانسەری گەردوون هیچی نەمابێتو ئێمەش لەو تیشکەیدا بژین کە سەرەتاکەی بووە بەکۆتایی . . واتا ئێمە لەکۆتاییەوە دەستمان پێکردبێت نەك لەسەرەتاوە ! ! ؟ ئەمانە مەسەلە گەلێکن بڕێکی زۆریان لەزانستو تێڕوانینو تێفکرین پێدەوێت . .

### هێشووی مەجەرەکان Clusters of Galaxies

گەردوونی بینراو لە ١٠٠هەزار ملیۆن مەجەرە زیاتر پێکهاتووە ، گشت ئەم مەجەرانە بەردەوام بەهەموو لایەکداو بەگشت ئاکارێکدا ڕەوت دەکەنو لێكدوور دەکەونەوە ، تەنها ئەو مەجەرانە نەبێت کە پێکەوە کۆمەڵ یا هێشووی جۆراوجۆریان پێکهێناوە . . هێشووی کۆمەڵەی (کۆما) گەورەترین کۆمەڵە مەجەرەیە لەگەردووندا ، ئەم کۆمەڵە بریتیە لە ١٠٠٠٠ر١٠مەجەرەو نزیکەی ٢٢٠ ملیۆن ساڵی ڕووناکی لەمەجەرەکەمانەوە دوورە ، کەچی هێشووی کۆمەڵەی ناوخۆیی Local Group – کە مەجەرەکەی خۆشمان یەکێکە لەئەندامەکانی – بچووکترین کۆمەڵەو تەنها ١٨ مەجەرەی تێدایە .

## پێك داکێشانی مەجەرەکان

پێك داکێشانی مەجەرەکان شتێکە دەشێت رووبدات ، مەجەرەکانی هێشووەکانیش هەردەبێت بەنزیکی یەکتردا تێپەڕن و بەریەك بکەون ، دووریش نییە دوو مەجەرەی هەوری ماجەلانی گەورەو بچووك ، کاتی خۆی بەر مەجەرەکەمان کەوتبێتن . لێکدانی مەجەرەکان شتێکی سامناك و ترسێنەر نییە وەك بەخەیاڵدا دێت ، سەرەرای ئەوەی هەر مەجەرەیەك و هەزارەها ملیۆن ئەستێرەی تێدایە ، چونکە دووری نێوان ئەستێرەکان یەگجار گەورەو بێ سنوورە

جا لەبەر ئەوە هەر مەجەرەیەك لەو

دوانە بەناو ئەوتریاندا رەت دەبێت . بەبێ ئەوەی نیزام و پێڕەویان تێك بچێت و شێوازیان بشێوێت و ئەستێرەکانیان بفەوتێت . . . ئەوەندە هەیە ئەتۆمەکانی هەورە گازییەکان بەتوندی بەریەك دەکەون و لێك دەدەن و گازەکان بەخێرایی سەدەها کیلۆمەتر لەچرکەیەکدا دەردەپەڕن و گەرمی یەکی گەورە دروست دەکەن و ئەتۆمەکانیان ئایۆ ناوی (بارگاوی) دەبن و لەئەنجامدا ئیشارەتی رادیۆیی زۆر بەهێز رەوانەدەکەن کە ملیۆنەها جار لە ئیشارەتی ئەستێرە رادیۆیی یەکان بەهێزترن .

## مردن و نەمانی مەجەرەکان

هەرچەندە ژمارەی ئەستێرە پیرە بە تەمەنەکان لەمەجەرەدا زیاتربێت و هەوری گازی هایدرۆجین کەمتربێت ، ئەوا مانای پیربوون و بەساڵاچوونی مەجەرەکەیە . ئەمەش بەتەواوی نەمەجەرە هێلکەیی یەکاندا دەبینین ، جا کاتێك دەچێتە سنەوە . ماددەکەی دەست دەکات بەشلەژان و لە ئەنجامدا تەقینەوەی مەزن و تیشکی رادیۆیی بەهێزو ووزەی بێ شومارو تیشکی پرشنگداری لێ پەیدادەبێت . . رەنگە ئەوەش لەئەنجامی شلەژانی بارودۆخی هەزارەها ملیۆن ئەستێرەی بەتەمەنی نێومەجەرەکە بێت ، کە نەریتی ئاسایی خۆیان

دەگۆڕن و خولگەکانیان دەگۆڕن و سوورانەوەیان لە ناو مەجەرەدا خێراتر دەبێت ، بۆ ئەوەی لە چارەنووسی حەتمییان رزگاریان بێت ، کە ئەویش کێشانێتی بەرەوو ناوجەرگەی مەجەرە لە ئەنجامی زیادبوونی هێزی راکێشانی . . . سەرەنجام ناوجەرگەی مەجەرە دەتەقێتەوە ، تەقینەوەیەکی سامناك کە مێشك پەی پێ نابات و خەیاڵ و ئەندێشە درکی کات ، چونکە لە مەودای بۆچوونی بیرومێشکمان بەدەرە . . تەنها ئەوەندە دەتوانین بڵێین کە تەقینەوەی مەجەرە ، ملیۆنەها جار بەتینترە لە تەقینەوەی (کڵپەداری مەزن Super Nova[١٥] تەقینەوەی مەجەرەی M82 – کە ١٠ملیۆن ساڵی رووناکی دوورە – بەرووتی لە روانگەکانی زەوییەوە تێبینی کرا . . تەقینەوەی ناوجەرگەی ئەم مەجەرەیەو لێکدانی ترسناکی ئەستێرەکانی . بووە هۆی دەرپەڕانی کڵپەی مەزنی وێرانکەر کە بۆ دووری ١٤٠هەزار ملیۆن ملیۆن کیلۆمەتر لە بۆشاییدا درێژەوەبوو . لەگەڵ شەپۆلی توندوتیژی ووزەو تیشکی بەهێزو لافاوی ماددەی ئەستێرە پەرش و بڵاوەکان .

بە ژماردنی خێرایی بڵێسە گازییەکانی ئەم تەقینەوەیە دەرکەوت کە تەقینەوەی مەجەرەی M82 ماوەیەکی کورت دوای پێکهاتنی دەستی پێ کردووە ، کەرەنگە ٥ر١ ملیۆن ساڵی زیاتر نەخایاندبێت ، بەخستنەسەری دوورییەکەشیان کە ١٠ملیۆن ساڵی رووناکییە ، دەردەکەوێت کە مەجەرەکە ٥ر١١ ملیۆن ساڵ لەمەوپێش تەقیوەتەوە ، واتا لەوکاتەدا کەمرۆڤ هێشتا لەسەر رووی زەوی نەبووە ، چونکە ئەو تیشکەی رەوانەی کردووە ١٠ملیۆن ساڵی خایاندووە تاپێیان گەیشتووە ئەی باشە دەبێت ئێستا چی بەسەردا هاتبێت ! ! ؟

زانایانی گەردوون و ئەتۆم ، ووزەی تەقینەوەی مەجەرەی M82یان خەمڵاندووە بەووزەی ٢٠٠٠بلیۆن بلیۆن بلیۆن بۆمبای هایدرۆجینی گەورە واتا ژمارە (٢) و (٣٠) سفری لای راستەوە ! ! تەنها یەك لەم بۆمبایانەش گەورە ترین شاری سەر رووی زەوی لەسەر نەخشە دەسرێتەوە . . بەڵام

تەقینەوەی لەمەش مەزنترو سامناکتر هەیە . . تەقینەوری مەجەرەی ئەوتۆ تێبینی کراوە کە وزەی تەقینەوەیان دەگاتە ١٠ بلێون بلێون بلێون بلێون بۆمبای هایدرۆجینی گەورە ، واتا ژمارە (١٠) و (٤٦) سفری لەپێش ، واتا تەقینەوەیان بلیۆنەها جار لەتەقینەوەی مەجەرەی M82 بەهێزترە ! ! !

## پەراوێزەکان

(١) پێشینان ئەم دیمەنە سپییە تەماویەی ئاسمانیان چواندووە بە (ڕێی کاکێشان) کاتێك کاکێش بەرێگەیەکدا ڕەتدەبێتو ووردەکای لێدەکەوێتو پەرشو بڵاودەبێتو ڕێگەکەی پێسپی دەچێتەوە . بەعەرەبیش (درب التبانه) یا (الطریق اللبنی) ، بە ئینگلیزیش (Milky Way)ی پێدەووترێت ، کە هەموو هەرهەمان مانا دەگەیەنن .

(٢) ووشەی (المجرة) لەعەرەبیدا بەمانای (ڕووبار)دێت ، ڕاستیەکشی تائێستا ووشەیەکی هاومانای بۆ دانەنراوە لەکوردیدا ، لەبەرئەوە هەربەکارهێنانی زاراوە باوو بڵاوەکەم بەجوانترزانی .

(٣) سەدیم Nebulae

بارستەی مەزنە لەگازوتۆز بەشێوەی پەڵەی جۆراوجۆر لەگەردووندا دەردەکەوێت . هەندێك لەم سەدیمانە ڕۆشنن بەهۆی ئەستێرەکانی نێوی یادەوروپشتی . هەندێکی تریشیان تاریکن کەبەزۆری لە گەردی تۆزی ووردپێکهاتووە . سەدیم سەرچاوەو هەوێنی دروستبوونی ئەستێرەو مەجەرەکانە .

(٤) هەسار Planet

جیاوازیان لەگەڵ ئەستێرەکاندا ئەوەندەیە کە ئەمانە تەنی ڕۆشنو کڵپەدار نین ، ڕۆشناییشیان لەو ئەستێرەیەوە وەردەگرت کە بەدەوریدا دەسووڕێنەوە ، لە نموونەی زەوی ، مەریخ ، زوحەل ، پلۆتۆ . . . هتد .

(٥) کلکدار Comet

تەنی ئەوتۆن بەشێوەیەکی ڕێكوپێك لە خولگەی فراواندا ، بەدەوری خۆردا دەسووڕێنەوە . لەکاتی نزیكبوونەوەیان لەخۆرەوە ، کلکێکی ڕۆشن لە پاش خۆیانەوە جێدەهێڵن ، کە هەندێكجار درێژیان دەگاتە ملیۆنەها کیلۆمەتر .

(٦) نەیزەك Meteor

تەنی ڕەقن بەدەوری خۆردا دەسووڕێنەوە ، کاتێك دەکەوێتە نێو کایەی کێشکردنی زەویەوە ڕادەکێشرێنو لەئەنجامی تێپەڕبوونو لێكخشاندنی بەبەرگی هەوایی زەوی دەسووتێنو بەجوانی دەبینرێن .

(٧) زەبەلاحە سوورو شینەکان Blew & Red Giants هەنگاوێکە لەپەرەسەندنی ژیانی ئەستێرەکانداو تیایدا قەوارەی ئەستێرەکە گەورەدەبێت کە ڕەنگە بگاتە ملیۆن ئەوەندەی خۆر . بەگوێرەی ڕەنگی تیشکەکانیان سوور یاشین دەردەکەون .

(٨) گرگنی سپی White Dwarfs

هەنگاوێکە دوای هەنگاوی زەبەلاحی ، تیایدا ئەستێرەکە دەچێتەوە یەكو چڕیەکەی زۆر زیاد دەکات بەڕەنگێك یەك کەوچکە چایەك لە ماددەکەی یەك ملیار تەن دەکێشێت . ئەتۆمەکانیشی لەباری ئاسایی خۆیاندا نامێننو ئەلیکترۆنەکانیان ون دەکەنو هەر ناوەك دەمێنێتەوە .

(٩) ئەستێرە گۆڕاوەکان Variable Stars

ئەو ئەستێرانەن کە پرشنگدانەوەیان جێگیرنییەو لە ماوەی ڕێكیانارێکدا زیاد یاکەم دەکات .

(١٠) ساڵی ڕووناکی Light Year

یەکەی پێوانەی دووریە لەئەستێرەناسیدا . بریتیە لەو دوریەی کە ڕووناکی لەماوەی ساڵێکدا دەیبڕێت ، بەخێرایی ٣٠٠٠٠٠ کلیۆمەتر لە چرکەیەکدا واتا :

٦٠× ٦٠ × ٢٤ × ٣٦٥ × ٣٠٠٠٠٠٠

کەدەکاتە نزیکەی ١٠ ملیۆن ملیۆن کیلۆمەتر

(١١) کوازار (شێوە ئەستێرەکان Quasars

دوورترینو سەیرترین تەنن کە تائێستا لەگەردووندا دۆزرابێتنەوەو دەکەونە کەناری سنووری گەردوون ، کوزار 273C3 (١٢) هەزار ملیۆن ساڵی ڕووناکی دوورە . هێزی ئەو ئیشارەتە ڕادیۆیی یانەی ڕەوانەی دەکەن ڕەنگە ملیۆن ئەوەندەی هێزی ئیشارەتی مەجەرەکەمان بێت . تائێستاش سەرچاوەی ئەم ووزە بێشومارە نەزانراوە .

(١٢) پولسار Pulsar

ئەستێرەی نیوترۆنین ، لەماوەی ڕێكوپێکدا ئیشارەتی ڕادیۆیی دەنێرن ، بەخێراییەکی خەیاڵی بەدەوری خۆیاندا دەسووڕێنەوە ، بەجۆرێك هەرسوڕێك بەکەرتی چرکەیەك تەواو دەکات .

(١٣) کەلێنی ڕەش Black Hole

سەیرترین دیاردەیە لەگەردووندا ، هێزێکی کێشکردنی بێ شوماری هەیە ، بەڕادەیەکی ئەوتۆ ، هەرچی لە دەوروپشت بێت کێشی دەکات . بەبێ ئەوەی ماوەبدات کە هیچ شتێك - تەنانەت ڕووناکیشی - لێدەربازبێت ، هەر لەبەرئەمەشە ئەم ناوەی لێنراوە .

(١٤) لادانی دۆپلەر Doppler shift

بریتیە لەلادانی هێڵەکانی شەبەنگی تەنە ئاسمانیەکان ، بڕی ئەم لادانەش ڕاستەوانە دەگوڕێت لەگەڵ دوورکەوتنەوە ونزیكبوونەوەی ئەستێرە یامەجەرەکە . ئەم دیاردەیەش بەزۆری لە ڕوانگەکاندا بەکاردەهێنرێت ، بۆ زانینی جووڵەو خێرایی تەنە ئاسمانیەکان .

(١٥) نۆڤا Nova

بریتیە لەتەقینەوەی مەزن لەژیانی ئەستێرەدا . ڕۆشنایی و پرشنگ دانەوەیەکی بەهێزی هەیە کە دەگاتە ٤٠٠٠٠ ئەوەندەی پرشنگدانەوەی بنەرەتی . بەڵام گەر ئەستێرەکە هەمووی تەقیەوە ئەوا پێی دەووترێت Super nova کە پرشنگ دانەوەی ڕەنگە بگاتە پرشنگ دانەوەی مەجەرەیەك بەگشتی .

## سەرچاوەکان :


١ - رؤوف وصفي ، زهير الكرمي ، سلسلة (عالم المعرفة) رقم (١٧) الكون والثقوب السوداء ، (الكويت ١٩٧٩) .

٢ - د . فياض النجم ، د . حميد مجول ، فيزياء الجو والفضاء - علم الفلك (بغداد ١٩٨١)

٣ - عبدالمنعم السيدعشري ، الكواكب والنجوم والمجرات ، (القاهرة ١٩٨٣) .

٤ - David Baker, Astronomy, Hamlyn Publishing Group Ltd, 1980

٥ - مجلة الفيصل ، العدد (٩٢) ، (نوفمبر ١٩٨٤) .

اكرام عبدالجبار محمد

# بوز ئەرسەلان و بەرهەم ژ زاروكان ڕە

ئەڤ چەند یاری و پارچە هوزان مە ژ پەرتووکا ئالفابێ ALFABE[1] یا سەیدایێ محمد امین بوزارسلان ڕەرگرتنە .

سەیدایێ بوزارسلان ئەڤ پەرتووك ژ بو دەستپێکەرێن خوەندنا کوردی دانی‌یە و ب چەند هەڤوك و پارچە هوزان و یاریێن فولکلوری خەملاندی‌یە .

سەیدا د پێشگوتنا پەرتووکی‌دە دبێژە :

«ئامانجا ڤێ ئالفابێ ئەڤە کو ب ئاواکی هێسان خوەندن و نڤیسینێ هینێ خەلکێ ، خاسما هینێ خورتان بکە .

لێ دڤێ ئەڤ هینبکرن ب ئالیکاریا خوەندایان بێ پێکانین . لەورا خەلك ژ بەرخوەڤە نکارە هینێ خوەندن و نڤیسینێ بە .

ئەڤ ئالفابێ ب ئاواکی وسا هاتی‌یە نڤیسین کو ، مروڤەکی خوەندا ب ئالیکاریا ڤێ ئالفابێ د دەمەکی کورت‌دا دکارە خوەندن و نڤیسینێ هینێ گەلەك مروڤێن نەخوەندی بکە» .

**دبستان[2]**

ئیسالێ د گوندێ مەدا ئاڤابوویە دبستان . ئەم تەڤ تێدا دخوینن ، قەلەم – دەفتەر د دەستان . دخەبتن ئەم هەرگاڤ ، نزانن چی‌یە وەستان . چقاس خوەشە ئەڤ خوەندن ! بژی دبستان .

**ڤەشارتوك[3]**

– هایدێن ، ئەم ڤەشارتوکێ بلیزن .

– دەلال ! تو چاڤێن خوە بگرە . .

– باشە . . هایدێن ، خوە ڤەشێرن . . .

– کو مە گوت ! «هەلال» ، چاڤێن خوە ڤەکە و ل مە بگەرە . .

– هەلاااال ، خوەش هەلاااال ! . . .

– هێێێل ! . دەلال ، تە من نەگرت . . .

– ئەبووو ! . . شێرو . من تە گرت . . . ئیجار تو چاڤێن خوە بگرە . . .

**سەرسال**

– سەرێ سالێ بنێ سالێ ، خوەدێ بهێلە خورتێ مالێ .

– دونی – مونی مالاڤا ، خوەدێ خورتێ مالێ بکە زاڤا .

**قازا مە**

قازا مە خوەشکە ، دمەشە ب ناز .

گەوریا وێ خوار و زراڤ و درێژە ، وەکی گاز .

د گولێدا ئاڤێ دکە ، ل سەر ئاڤێ دمەشە .

جارنا ژی دقیرە ، دەنگێ وێ مینایە دەنگێ ساز .

### گایێ قیرۆ

گایێ مە یێ رەش ، ناڤێ وی قیرۆیە .
جۆتێ مە دکە ، زەڤیا مە داژۆ ، شووڤێن مە تژی دکە .
بێدەرا مە دکوتە ، مۆشەنێ[٤] دکێشە .
ئەز ژی ل مۆشەنێ سوار دبم ، مۆشەن پر خوەشە .

### پێنجۆك

– شێرۆ ! . . رندێ ! . . وەرن ئەم ب پێنجۆکان بلیزن .
– هایدێ مەمۆ ! . . پێنج خیچك بینە . .
– ئاها پێنج خیچك[٥] ! . . هایدێن ، ئەم دەست پێ بکن .
– زینێ ! . . تو کەتی ، ئیجار دۆرا منە . .

### تەرالی نەباشە

تەرالی کارەکی نەباشە ، پر و پر بێخێرە .
تو کەسەکی ترالان نائەڤینە . . چ ل گوندبە ، چ ژی ل بازێرە .
کەسێ تەرال تم برچییە ، تم تازییە و یێ کێرە .
کەسێ خەباتکار ژی بەژنا وی نوویە ، بەریکا وی تژییە و زکێ وی تێرە .

### خوەندا و نەخوەندی

کەسێ خوەندا زانایە ، نەخوەندی ژی نەزانە .
کەسێ خوەندا تم تێرە ، نەخوەندی هەر خزانە .
خوەندا تم پێشەوایە ، نەخوەندی ل بەر پەزانە .
قەدرێ خوەندا بلندە ، نەخوەندی تم ئەرزانە .

### لۆری ، لۆری . .

– زینێ ! . رازێ ، کو تو مەزن بی ، هەری دبستانێ .
– دایێ ! . ما تو دێ من بشینی دبستانێ .
– ئەرێ کەچا من ! . ئەز دێ زینا خوە بشینم دبستانێ .
– . . . . . . .
– دێ لۆری لۆری . . . زینا من لۆری . . .
ئەز زینا خوە دهەژینم .
ب شیر و شەکر دمژینم .
پێ خەمێ دلێ خوە درەڤینم .
ئەز دێ شارا سەرێ خوە بفرۆشم ، پێ ژ زینا خوەرا دەفتەر و قەلەم بستینم .
زینا خوە بشینم دبستانێ ، وێ ژ نەزانی و خزانییێ بدەرینم .

### مامۆستایێ گوندێ مە

مامۆستایێ گوندێ مە ، خۆرتەکی گەلەك ژیرە .
ژ دل دەرسا زاروکان ددە ، ژ وانرا وەك باڤ و باپیرە .
دەما دەرس دقەدن ، تم پرتووکان دخوینە . . پر ژی ب ژیرە .
ژگوندییانرا ژی پێشەوایە . . رێیا ژینێ نیشا وان ددە . . ژ وانرا دەستەگیرە . .

### چەم[٦]

چەمێ مەزن ، چەمێ تژی ئاڤ ، چەمێ جوامێر .
ژ مەرا ئاڤا ژینێ تینە . . ژ زۆر تینە ژێر .
ئەم ل سەرێ سوکور ئاڤادکن ، ژێ دەردخن ئەلەکتریکا رۆهنی ، ئا وەك زێر .
ئەم پێ زەڤیان ژی ئاڤددن . . ژوان دگرن گەلەك کەد . گەلەك خێر و بێر .

### ئەز و پەز

ئەز دچم بەر پێز ، پەزێ خوە دچێرینم .
پەزێ خوە دبم ، ل مێرگان دگەرینم .
چاخا بێرییێ ، ئەز پەزێ خوە بەر ب مەخەل تینم .
چاخا شەڤینێ ژی پفدکم بلوورێ ، پەزێ خوە ل دۆرا خوە دجڤینم .

### فندا زاڤێ

دیلانە دیلان . . دیلانا خەزالێ و لەزگینە . .

برازاڤا فندان ڤێدخه و د ناڤ هەنێدا دچکینه .
مەمۆ تەبەڤا فندان دگێره و ل سەر زاڤێ دگەرینه .
خۆرت چەپکان دکوتن و دسترێن . . . تەڤ ب کێف و شادینه .

### ژن

ژن هەڤالێن مێرانن ، هەڤالێن وانێ ژینێ و کارن .
ژن نیڤێ مللەتن ، د وەلات و مللەتدا خوەدی پارن .
دڤێ ئەم قەدرێ ژنان بزانبن ، ژ وانرا تم باش بن .
کەسێن کو ل ژنان سەردەستی دکن ، بزانبن کو ئەو زۆردارن .

### شڤانۆ !

شڤانۆ ، شڤانۆ ! . . . شڤانێ پەزێ سۆر .
تو ب کولاڤێ خوە یێ سپی ل سەر مێرگان دگەری گۆر ب گۆر . .
د سارییاندا دەنگێ بلوورا تە یا زەر دچە بەژێر و بەژۆر . .
تو هەر سێ هەلاتنا رۆژێ دبینی . .
خوەزی بتە ، لۆ شڤانێ پەزێ سور .

**دەهمەن و تێبینی** :–

(١) –
ALFABE – M.EMIN BOZARSLAN – 1968 – ISTANBUL

(٢) – دبستان : خویندنگەهـ ، قوتابخانه .
(٣) – ڤەشارتۆك : خەزالێ ، چاوشارکێ .
(٤) – مۆشەن : جەنجەره .
(٥) – خیچلك : بەرك ، بەردی بچووك .
(٦) – چەم : رووبار .

● مامۆستایێ «بۆزارسلان» ژ «و» ١ گرێدانێرە «وو U» نڤیسی‌یە . لێ ئەڤ چەوتی‌یە دڤێ ب یەك «و»ێ یێ نڤیسین و من ژی ب یەکێ نڤیسی‌یە .

● قەلەوکرنا تیپان د رێنڤیسا لاتینی‌دە ب دانینا خالاًن ل سەر تیپانە ، یان ب دووبارەکرنا تیپی‌یە . لێ سەیدایێ «بۆزارسلان» چ ژڤان هەردوویان ب کار نەئانی‌یە و هەر تیپ ب تەنێ نڤیسی‌یە . لێ ژ بەر راست خوەندنێ ژ خوەندەڤانانرە من ئالاڤێن قەلەوکرنێ د رێنڤیسا عەرەبی‌دە ب کار ئانین .

دوونشینیری گشتی

# منداڵ

## چۆن فێرى درۆ دەبێت و چۆن

یەکێك لەو گیروگرفتانەی کە پەیوەندی‌یەکی زۆریان بە ترسی منداڵەوە هەیە ، درۆکردنە ، چونکە مەبەستی منداڵ لە درۆکردن ، راستی گۆرین نیە ، بەڵکو خۆ پاراستن‌و رزگارکردنە لە سزادان .

دەروون زانەکان گرنگی‌یەکی زۆریان بە لێکۆڵینەوەی رەوشتی درۆی منداڵداوە ، ئەویش لەبەر ئەوەیە ، پەیوەندی‌یەکی زۆر لە نێوان دزی‌کردن‌و گزی‌کردن‌و درۆدا هەیە ، چونکە هەرسێکیان برێتین لە (ناپاکی – عدم الأمانه) ، درۆ برێتی‌یە لە ناپاکی لە قسەکردندا ، دزی برێتی‌یە لە ناپاکی (دەست پیسی) لە ماڵی کەسانی تردا ، بەڵام گزی‌کردن برێتی‌یە لە کردەوەی ناراست‌و فێڵ‌و فرکردن‌و خەڵەتاندنی کەسانی دیکە .

هەروەها ئەو زانایانە بۆیان دەرکەوتووە کە (تاوانی نەوجوانان – جرائم الأحداث) پەیوەندی‌یەکی تەواوی بەو سێ سیفەتەوە هەیە .

# چارەسەری دەكرێت

جەلال خەلەف زاڵەیی

## هۆكانی درۆكردنی منداڵ

پێش ئەوەی بچینە ناخی بابەتەكەوە ، پێویستە بڵێین : كە درۆزنی لەمرۆڤدا سیفەتێكی بۆماوەیی‌و ڕەچەڵەكی نیە ، مادام وایە ، ئەوباسە راست نیە كە دەڵێت : منداڵی پشت مل چاڵ كە گەورەبوو درۆزن دەبێت ، ئەمە وا دەگەیەنێت منداڵ لە دەوروبەری خۆیەوە فێری راست گۆیی دەبێت ، ئەگەر كەسەكانی دەوروبەری راست‌گۆبن‌و خاوەنی قسەی خۆیان بن ، ئەوە ئەویش راست گۆدەبێت‌و لە وادەو واتەو كردەوەی خۆیدا لەملی بدەیت ، درۆناكات‌و پەشیمان نابێتەوە ، ئەگەر گەورەكانی دەورو بەریشی لە درۆكردن‌و گومان بردن‌و فێڵ‌و تەڵەكە بازیدا ، ژیان ، ئەوە ئەویش ڕێگەی باوكی خۆی وون ناكات‌و درۆزن دەبێت‌و گیا لەسەر بنجی خۆی دەروێتەوە .

بێجگە لەمەش زۆر كەرەت باوك بەدەستی خۆی منداڵەكەی گەمارۆ دەدات‌و لای لێدەبڕێتەوەو ، هەلی بۆ هەڵدەخات ، كە فێری درۆكردن بێت ، بۆنموونە :

باوكێك هەبوو لەكاتی پشوی نێوەڕۆدا ، یەكێك لە زەنگوڵەی دەرگاكەیانی بدایەو هەواڵی ئەوی بپرسیایە ، بەمنداڵەكەی دەووت :

ئەگەر منیان دەوێت بڵێ باوكم لە ماڵ نیە ، یان كە زەنگی تەلەفوونەكەیان دەزرایەوە ، دەی ووت : ئەگەر منیان دەوێت : بڵێ باوكم لەماڵ نیە ! !

منداڵەكەیشی لەبەرخۆیەوە دەی ووت ! وا دیارە درۆكردن كارێكی بەسندەو هیچیشی تێ‌ناچێت ، ئەگینا باوكم چۆن درۆ دەكات ؟ ! دوای ئەوە كە باوكی لەسەر درۆكردن سزای‌دەدا ، بە بڕیارێكی ستەم‌و كارێكی نارەوای دەزانی ! دەی ووت : بۆچی بۆ ئەو حەلاڵەو بۆمن حەرامە . ؟

بێجگە لەمەش زۆر جار ڕێدەكەوێت ، منداڵ پیاڵەیەك یان پەرداخێك یان گوڵدانێكی بەنرخ دەشكێنێت ، لە ترسا هاشای لێدەكات ، بەڵام بەخێوكەری هەر سزای دەدات‌و دەی ترسێنێت‌و سەرزەنشتی دەكات‌و ناوی دەزڕێنێت ، لەو وایە بەم سزایانە ، لە درۆكردن دەی ڕەوێنێتەوە ، نازانێت ئا بەمە زیاتر هانی دەدات‌و سوری دەكات لەسەر درۆكردن .

لێرەدا پرسیارێك دێتە كایەوەو دەڵێت : ئایە هیچ كاركەرێكی سروشتی‌و بۆماوەیی هەیە ، كە منداڵ بشێنێت‌و یارمەتی بدات ، لەسەر فێربوونی درۆكردن ؟

لە وەڵامدا دەڵێین : بەڵێ هەیە ، چونكە دەروون زانەكان دەڵێن :

دوو توانای بۆماوەیی هەن ، منداڵ هەڵدەكەوێنن ، بۆ ئەوەی فێری درۆكردن ببێت :

یەكەمیان : دەم هەراشی‌و زوبان لە باری‌یە ! واتا : ئەو منداڵانەی دەم هەراش‌و زوبان لەبارن ، ئەشێ زۆتر فێری درۆكردن ببن ، لە منداڵانی دیكە .

دووەمیان : خەیاڵ بەپیتی‌و خەیاڵ چالاكی‌یە ! واتا : ئەو منداڵانەی خەیاڵیان بەهێزە زووتر فێری درۆكردن دەبن ، یان

بەخەیاڵ رووداوی سەیرتر ، دروست دەکەن ، وەك لە منداڵێکی ئاسایی .

خوێنەری بەرێز : زۆر هۆی کۆمەلآیەتیو خێزانی هەن منداڵ فێری درۆ دەکەن ، ئەمانەو ئەو دوو کارکەرە سروشتییانە ، بوونەتە هۆی ئەوەی زاناکان ، درۆی منداڵ بکەنە چەند بەشێکەوە ، ناوی هەر بەشێکیان بەناوی هۆکەیەوە ناو ناوە (تسمیة الشیئ باسم السبب)

## جۆرەکانی درۆ

### یەکەم : درۆی خەیاڵی :

### چەند نموونەیەك بۆ درۆی خەیاڵی :

١ – جارێك منداڵێکی سێ ساڵ بەباوکی دەووت : سەگێکی شاخدارم بینی ، باوکیشی لەسەر یەك تێی دەخوریو دەی ووت : رۆڵە تکات لێدەکەم درۆی وا زل مەکە ، ئێمە کێمان وا درۆزن بووە ؟ ! ئەمە لە کێ دەچێت ؟ ! ئەم باوکە نەیدەزانی ئەم منداڵە بەخەیاڵ سەری کارەدانییە کەیانی بریوەو نوسانێتی بەسەری سەگەکەوە ، ئەمە لەو منداڵە دەچێت کە ئەویش تەمەنی سێ ساڵ بوو حەزی دەکرد ببێتە باوکی ، چونکە دەیبینی هەموو قسەیەکی رەوایە لە ماڵدا ، ئەمجا دەی ووت : بابە با سەرمان بگۆرینەوە من ئەبم بەباوکە ، تۆش ببە بەمن .

٢ – رۆژێك منداڵێکی چوار ساڵ هاواری لێ هەڵسا ، ووتی : مارێکم لەژێر مێزی نوسینی براکەمدا بینی ، تێکرا ئەندامانی خیزانەکە راچەنینو داواڵینو کونو قوژبنی ژورەکەیان پشکنیو تاقیان کردەوە ، بۆ ئەوەی مارەکە بکوژن ، بەلآم بێ دەستکەوت بوون ، لە دواییدا لێیان پرسی کوانێ لە کوێدایە ؟ لە وەلآمدا ووتی : ماری ناوکتێبەکەی بوو هاتە دەرەوە ، وا دیارە چووەتەوە شوێنی خۆی ، تومەس مەبەستی وینەی مارە !

ئەم جۆرە درۆیانە پێیان دەووترێت درۆی خەیاڵی خوێنەری بەرێز : ئەمجا نازانین ئەم راستی گۆرانانە درۆن یان راستن؟ ئەگەر درۆن ، ئایە کەڵکیان هەیە ، یان زیان بەخشن ؟ لە وەلآمدا دەڵێین ! ئەگەر بەم منالآنە بڵێین : درۆزن ، دەبێت بەشاعرو رومان نوسەکانیش بڵێین : درۆزن ! ! لە راستیدا ئەم جۆرە هەڵبەستانە (درۆی خەیاڵی) هەر بەناو درۆن ، چونکە نەراستن نەدرۆن ! ! بەڵکو جۆرە گاڵتەو گەپێکن ، بەلآم لەبارەی ئەوەوە کە ئایە کەڵکی هەیە یان زیان ، زۆر لە زاناکان دەڵێن ! ئەو منداڵانەی کە درۆی خەیاڵی یان زۆرە دوور نین کە ببنە (شاعر) یان (رومان نوس) یان هەر بەهرەوەرێکی دیکە ، ئەی بۆچی نەبێت ؟ ئەی گوایە ئەو کچە ووردیلە ، دەم هەراشە ، زوبان لوسە ، درۆزنەی . کە باوکی بردیە لای پزیشکێکی دەروونی ، بۆ ئەوەی درۆزنێکەی نەیەڵێتو راستگۆی کات ، پێی نەورت : ئەم منداڵەی تۆ ، یان دەبێتە شاعر یان نوسەر ، ئەمە پاشەرۆژێکی دیاریی ، هەیە ، ئایە راستی نەکرد ؟

### دووەم : درۆی لێگۆران :

(درۆی لێگۆران – الکذب الالتباسی) هۆی ئەوەیە منداڵەکە ناتوانێت ، ئەوەی بەراستی دەی یبینێتو ئەوەی لە خەیاڵیدایە ، لەیەك جیایان بکاتەوە .

کاتی وا هەیە رووداوێك بەخەو دەبینێت ، وا دەزانێت بە راستی بینیوێتی ، بۆنموونە : منداڵێك لەخەودا سەگێك گازی لەدەستی گرتبوو ، هەڵسابوو دەگریا ، دەی ووت : دەستم ژان دەکات سەگ گازی لێگرتووە ، لەگەڵ ئەوەشدا سەگ لەو ناوە نەبوو .

درۆی لێگۆران ، کە منداڵەکە گەورەبوو ، هەر لەخۆیەوە دەرواتو نامێنێت .

### سێیەم : درۆی خۆ هەڵکێشان :

(درۆی خۆهەڵکێشان – الکذب الادعائی) ، بریتییە لەوەی کە زۆر لەو منداڵانەی ، هەست بە (کەمسەری – النقص) دەکەن ، بەخۆ هەڵکێشان ، یان کەسو کار هەڵکێشان ، پری دەکەنەوەو دای دەپۆشن .

ئەمیش بۆئەوەی پلەو پایەیەك بۆخۆیان دروستکەنو

دەستەلاّت ڕاکێشن ، بەسەر منداڵەکانی دیکەدا ، نموونەش بۆ ئەو منداڵانە زۆرە ، وەکو : ئەو منداڵەی بە (فشە) دەڵێت : هەموو جۆرە یاری‌یەکی هەیەو یەك بە یەك دەیان ژمێریت‌و باسیان دەکات ، یان بەدرۆ دەڵێت : باوکی پلەو پایەیەکی زۆر بڵندی هەیە یان بەریوەبەری فلاّنە دەستگایەو هاوڕێی فیسارە کەسە ، یان ئەوەندە تفەنگ چی‌یە جگەرە هەڵدەگرێت‌و بەفیشەکێك (٥٠) دوشمن دەکوژێت .

خوێنەری خۆشەویست : هەروەکو چۆن خۆ هەڵکێشان ئامرازێکە بۆ خۆ زل‌کردن‌و پلەو پایە پەیداکردن ، ئاوەهاش ئامرازێکە منداڵان بەکاری دەهێنن ، بۆ سەرنج‌و سۆز ڕاکێشان‌و خۆ بردنە پێشەوە ، بەلاّم ئەو منداڵانەی ژمەن بردەی سۆزن ، یان زۆر نازدارن ، ئەمانە بەخۆ نەخۆش خستن‌و خۆبورانەوە ، سۆزی کەسانی دەورو بەریان ، بۆلای خۆیان ڕادەکێشن .

هەروەها ئەو منداڵانەی کە لە وانەکانیاندا سەرکەوت‌و نابن ، ئەمانە بە بوختان کردن بە مامۆستاکانیاندا ، وەکو سزادان‌و ستەم لێکردن ، سەرنجی کەس‌و کاریان بۆلای خۆیان ڕادەکێشن‌و جێگەی خۆیان خۆش دەکەن .

ئەم جۆرە درۆی خۆ هەڵکێشانە ، تا زوو چارەسەر بکرێن درەنگە ، ئەگینا منداڵ‌کە گەورەبوو ، لەسەر فشەو فیشاڵ کردن‌و قسە هەڵبەستن‌و بوختان کردن‌و پرو پاگەندەکردن ، ڕادێت ، بەجۆرێك لە پاشە ڕۆژدا کار دەکەنە سەر پایەی کۆمەلاّیەتی ، بناغەی چارەسەرکردنەکەشی بەستراوە بەدۆزینەوەی ئەو مەبەستانەی کە منداڵ لە ڕێگەیاندا درۆ دەکات ، بۆ ئەوەی بۆی جی‌بەجێ بکرێت .

**چوارەم : درۆی بەدەست کەوتن :**

(درۆی بەدەست کەوتن – الکذب بغرض الاستحواذ) منداڵی نوجوان ، کاتێك دەی کەن ، کە کەس‌و کاریان کردەوەی ووشك‌و ڕەقیان لەگەڵ بکەن ، ئەوکاتە پارەو شیرینی مەبەستەکانیان لە ڕێگەی درۆووە بەدەست دەهێنن ، یان بەدرۆ دەڵێن : قوتابخانە داوای پارەمان لێدەکات کاتێك دەبینین : بۆخۆیان خەرجی دەکەن‌و ، ئەگەر لە یەکێکیان بپرسین : پارەت پێ هەیە ؟ لە وەلاّمدا دەڵێت : نەء ، با پێشی بێت . هۆی ئەمەش ئەوەیە ، ئەو منداڵەی چاودێری زۆربکرێت‌و کردەوەی توندو تیژی لەگەڵ بکرێت ، هەست دەکات کە لە جیهانێکی گوماندارو بێ باوەڕیدا دەژی ، ئەو کاتە چاو برسی‌تر دەبێت‌و تەماعکارتر دەبێت‌و ، لە کۆکردنەوەی شت‌و مەك تێر ناخوات .

**پێنجەم : درۆی تۆڵە سەندن :**

(درۆی تۆڵەسەندن – الکذب الانتقامی) ئەوەیە ، کە منداڵ بۆیە درۆ دەکات ، کە سزای منداڵێکی دیکە بدرێت ، یان ناوی بزرێت .

ئەو منداڵانەی کە درۆی تۆڵەسەندن دەکەن ، ئەوانەن ، کەرکیان لە منداڵانی دیکە دەبێتەوە ، یان کەس‌و کاریان بەشێوەیەکی یەکسانی ڕەفتاریان لەگەڵ ناکەن‌و بەیەك چاو تەماشایان ناکەن .

**شەشەم : درۆی بەرگری :**

(درۆی بەرگری – الکذب الدفاعی) بریتی‌یە لەوەی کە منداڵەکە بۆیە درۆ دەکات ، سزا نەدرێت‌و لێی نەدرێت ، یان هاوڕێیەکی لێی نەدرێت‌و سزا نەدرێت ، واتا شاهیدی بەناهەق .

چەندێك منداڵ تۆڵەو سزای توندو تیژتری لێ بسەنرێت . ئەوەندە زیاتر ئەم جۆرە درۆیانە دەکات‌و بەپێچەوانەوە . هەروەها منداڵ درۆ دەکات ، ئەگەر زانی ڕاست ووتن شتێکی لە کیس دەدات ، یان پایەو پلەیەکی لە کیس دەچێت !

**حەوتەم : درۆی چاولێکەری :**

(درۆی چاولێکەری – کذب التقلید) ئەوەیە گەورەی ماڵ ، بەتایبەتی باوك‌و دایك ، درۆ دەکەن ، ئەو کاتە منداڵەکانیشیان چاویان لێ دەکەن ، وەکو ! پەندە کوردی‌یەکە دەڵێت : گەورە ئاو دەرژێنێت ، بچوك پێی لێ دەخشێنێت .

### نموونەی درۆکانی گەورەش ئەمانەن

١ – منداڵەکانیان دەکەنە خەوو ، خۆیان بەدزی‌یەوە دەرۆنە دەرەوە بۆ ماڵان ، یان بۆ گەڕان ، لەوان وایە کە هەستی پێ ناکەن ، بەڵام کە هەستیان پێ کرد ، هەموو شەوێك بەترس‌و دڵە ڕاوکێوە دەنوون .

٢ – ئەگەر منداڵێکیان نەخۆش بێت‌و ببەن بۆلای پزیشك ، بۆ ئەوەی نەگری‌و نەترسێت ، بەدرۆ پێی دەڵێن ! دەتبەین بۆ گەڕان .

٣ – پەیمانیان دەدەنێ ، ئەگەر دەرچوون ، یان لە تاقی کردنەوەدا ، پلەی بەرزیان هینا ، دیاری‌و خەڵاتیان بۆ بکرن ، لە دواییدا پەشیمان دەبنەوەو پەیمانەکانیان نابەنە سەر .

٤ – منداڵەکانیان ، ئەگەر هەڵەیەك ، یان ناتەواوی‌یەکیان هەبێت ، لە بەرچاوی میوانەکانیان زۆر باسیان دەکەن‌و دەیان شکێنن .

### هەشتەم : درۆی بەردەوام :

درۆی بەردەوام یان درۆی نەخۆشی ، ئەوەیە کە ئەو منداڵە ، یان ئەو نەوجوانە ، ڕادێت لەسەر درۆکردن بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکات ، یان هەستی پێ‌دەکات ، بەڵام بەدەستی خۆی نیە .

ئەم منداڵە درۆزنانە ، زۆریان لە خوێندندا دواکەوتوون‌و ، هەست بەکەمسەری دەکەن‌و ، لەخۆیان رازی‌نین‌و کەس‌و کاریانیش لێیان رازی‌نیەو قوتابخانەش پێیان قایل نیە ، لەبەر درۆکانیان ، ئەمجا لەبەر ئەوە ، زۆر جار پەنا دەبەنە سەر دزی کردن ، بۆ ئەوەی هەست بەسەرکەوتن‌و ئارەزوو تێرکردن بکەن .

### چارەسەری درۆی منداڵ

خوێنەری بەرێز : پێش هەموو شتێك ، ئەوە بزانە ، بەر بە دەست کردن ، بەچارەسەری درۆی منداڵ ، چەند بناغەیەك هەن ، پێویستە ڕەچاویان بکەیت :

یەکەمیان : ئەوەیە ، دەبێت بزانیت ، درۆی منداڵەکە ، درۆیەکی کاتی‌یە ، یان هەمیشەیی‌یە ، واتا : درۆی زۆر دەکات ، یان لە چەند سەبارەتێکی تایبەتیدا ، درۆ دەکات .

دووەم : ئەوەیە کە بزانیت ، منداڵ تا تەمەنی کەمتر بێت ،درۆکانی بێ زیانترن‌و مەترسیان کەمتر لێ‌دەکرێت‌و ، تا تەمەنی گەورەتر بێت ، درۆکانی ، مەترسیان زیاتر لێ دەکرێت‌و ، پێویستە زووتر چارەسەر بکرێت .

بۆ نموونە : ئەگەر منداڵەکە تەمەنی لە (٤) چوار ساڵان کەمتر بوو درۆی ، زۆر گەورەی ڕێك دەخست‌و ڕووداوی زۆر دەگۆڕی ، هیچ پێویست ناکات سەرزەنشتی کەیت‌و بەدرۆزنی گوناهباری کەیت ، بەڵکو دەتوانیت بەشێوەی گاڵتەو گەپ مانای ڕاست‌و درۆی ، بۆروون بکەیتەوە .

ئەگەر تەمەنی منداڵەکە لە چوار ساڵ ، یان پێنج ساڵ زیاتر بوو ، پێویستە بەرووبەکی خۆشەوە ، گرنگی ڕاست گۆیی‌و کەڵکەکانی بۆباس بکەیت ، بەبێ ئەوەی پیا هەڵکاڵێیت‌و ، سەر زەنشتی بکەیت .

باشترین ڕێگە بۆ چارەسەر کردنی درۆی منداڵ ئەوەیە کە گەورەکانی دەوروبەری ، درۆ نەکەن‌و ڕاست گۆبن لە گەڵیداو ، ببنە پێشەوایەکی چاك ، لە وەفاداری‌و ڕاست گۆییدا .

ئەگەر هات‌و منداڵ دانی نا بەدرۆکەیداو ڕاستی ووت : باش وایە تازە سزای نەدرێت لەسەر درۆکەی ، بۆ ئەوەی نەگەرێتەوە بۆ درۆ کردن .

خراپترین ڕێگە بۆچارە سەرکردنی درۆ ، لێدان بەکارهێنان‌و سزادان‌و هەرەشەو گۆرەشەو ناو زراندن‌و گاڵتە پێ‌کردنەو شکاندنی منداڵەکەیە .

### گرنگترین سەرچاوەکان


١ – ملاك جرجيس – الدكتور – مشاكل أطفالنا النفسية ط ١ – القاهرة ١٩٧٣

٢ – ملاك جرجيس – الدكتور – مشاكل الصحة النفسية للاطفال – من منشورات الدار العربية للكتاب – طرابلس – ليبيا – ١٩٨٥

٣ – عبدالعزيز القوصى – الدكتور . اسس الصحة النفسية ط ٥ القاهرة ١٩٥٦

٤ – اسحق رمزى – الدكتور – علم النفس الفردى – ط ٣ – القاهرة ١٩٨١

٥ – مصادر أخرى

# «فاوست»ی هاوپەیمانی شەیتان

ئامادەکردنی حەسەن مەحموود ڕەسوڵ

ئەفسون[١] خەونێکی کۆنی مرۆڤە ، کۆنە بەقەدەر ئایینە سەرەتاییەکان ، بگرە بەر لەو ئاینانەش هەر هەبووە . وا زانراوە کە ئەفسون بریتی‌یە لە تقووسێکی ئەوتۆ کە دوورە لە مەسەلەی لاهووت ، بەڵام ئەفسونیش لاهووتی ڕەشی خۆی پێچەوانە ، یان دژی هەیە ، خۆ ئەگەر بۆمان هەبوو زاراوەیەکی زۆر هاوچەرخانەی بۆ بەکاربهێنین وەکو ئەوەی بۆمان بەکارهێنا لە ناو ئەو قسانەمان بۆ بابەتێکی ئێجگار کۆنی وەك ئەفسون ، ئەوە دەتوانین بڵێین کە ئەفسون (دژ – پەرستن)ە ، بگرە جۆرە یاخی‌بوونێکی ئەهریمەنانەو ئاژاوەیەکی ڕۆحی‌یە .

ئەقڵی مرۆڤایەتی هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە هەوڵی داوە ڕێگەیەك بدۆزێتەوە بۆ قووتاربوون لە ژیانی سەر زەمینی ، کە بتوانێت بەهۆیەوە بەرەنگاری مەترسیە نادیارەکان ببێتەوەو دڵنیایی‌و ئاسایش بەژیانی ببەخشێت . هەروەها ویستوێتی ڕێگایەك بدۆزێتەوە بۆ تێکەڵ بوون‌و گونجان لەگەڵ جیهان‌و هێزە نادیارەکاندا تا جۆرە مانایەك بە ژیانی ببەخشێت‌و (ئامانج)ێك لە ژیاندا دروست بکات بۆ بەرەنگاربوونەوەی مردن ، سەرەتای ئەم ڕەنجەش بەم پرسیارانە دەست پێ‌بکات : ئەم جیهانەی دەورو پشتی من چی‌یە ؟ چۆن دەتوانم خۆم لە مەترسیەکانی بپارێزم ؟

چۆن دەتوانم سات‌و سەودا لەگەڵ ئەو هێزانەدا بکەم کە هەموو ساتێك بەمردن‌و ترساندن ڕوو بەڕووم دەبنەوەو هەر ساتەی تەڵەی خراپەکاریەکم بۆ دەنێنەوە ؟ چۆن بزانم دەبێ چی بکەم ؟ .

لە منداڵێتی بیری مرۆڤایەتی‌دا ، پێش ئەوەی بگاتە ئاستی بیرکردنەوەی ئایینی‌ی ، پەنای دەبردە بەر ئەفسون بۆ خۆ دەربازکردن‌و لێکدانەوەی جیهان‌و هەوڵی دەدا بزانی‌و لە ڕێگەی ئەفسونەوە ئیشی خۆی مەیسەربکات . . .) پەیوەندی بکات بەهێزە سروشتیە شاردراوەکانەوەو لە زیان‌و خراپەکاریەکانیان خۆی بە دوور بگری‌و خۆی لە خراپەکاریی هاوچەشنەکانیش ڕزگار بکات .

لە دێر زەمانەوە ئەو ئەقڵە ئەقڵێکی کۆمەکیانە بووە ، تا کە کەس هەمیشە نێچیرێکی بەردەست‌و ئاسان بووە ، تاقە ڕێگایەکی لە بەردەما بووبێت باوەشی کۆمەڵ ، یان تیرە ، یان ئەشکەوتی تیرەو بۆچوونەکانی بووە واتە ئەو ئەقڵە کۆمەکییەی کە بە ئەفسون ڕوو بەڕوی جیهان بۆوە ، ئینجا شێوەیەکی پێشکەوتوتری وەرگرت ئەویش شێوەی ئایینی‌ی سەرەتایی بوو کە بەهۆیەوە توانرا سات‌و سەودا لەگەڵ هێزە شارراوەکان بەشێوەی تازەی پەرستن‌و گیان فیداکردن‌و تقووس‌و لاهووت‌و پێش‌بینی کەران‌و ئەوانەی کەشف‌و کەرامەتیان دەنواند بەتایبەتی گیان بەخش‌کەرەکانیان ، دەستیان کرد بە قوربانی پێشکەش کردن هەر لە ڕووەکەوە تا ئاژەڵ و تا ئادەمیزاد ، و سازکردنی‌تقووسی وا کەببێتە مایەی ڕەزامەندی هێزە شارراوەکان وپەیوەندی دۆستانەیان‌و دەسکەوتنی هەندێك زانیاری‌و پاراستنیان لەلایەن ئەوانەوە .

بەم جۆرە ئایین لەشێوە سەرەتایی‌یەکەیدا بەهۆی ئەفسونەوە



هاتە ناو ناوانو پەرەی سەند ئەگەر نەڵێین لە دوایدا بەتەواوی کردییە بەشێ لەخۆی . لەسەرەتادا مرۆڤ لەژێر باری قورسی‌ی جیهانو تەنگو چەڵەمەکانیدا کە لەگشت لایەکەوە ئابلۆقەیان دابوو دەینالاند ، هەستی کرد شەڕو توندو تیژی نواندن کە مردن ترۆپكو دواوێستگەی هەردووکیانە و لە ڕەگی جیهاندا حەشار دراون ، هەستیشی بەبێ دەسەلاتی کرد لە بەرەنگار بوونەوەی

ئەو جیهانەی کە بۆی دەرکەوت کە هیچی دەربارە نازانێ هەر وەك هیچ دەربارەی خۆیشی نازانێ ، گیانە چەپەڵو ئەهریمەنەکانی ئەهێنایە بەرچاوی خۆیو دەیخوڵقاندن پێش ئەوەی خەون بە بتو خواوەندە خوێناویەکانی‌یەوە ببێنی . بەئەفسونیش ساتو سەودای لەگەڵ ئەهریمەنەکانی خۆی دەکرد بۆ ئەوەی ڕازییان بکاتو چیتر ئازاری نەدەن .

کاتێ ئایین بەدەرکەوت ، لەنێوان ئەفسونو ئایین‌دا پەیوەندی‌یەکی بەیەکاچووی ناو یەك مندالأدان لە نێوانیاندا هەبوو ، هێندەی پێ نەچوو لەگەڵ پەرەسەندنی بیری ئایینی گۆڕا بە ملمڵانێو دووبەرەکی‌یەکی نزیكو بەرەکانی‌یەکی بێ کۆتایی نایەوە ، سەیریش نیە چونکە ئەفسونو ئاین دوو هەڵوێستی دژبەیەکی یەك قۆناغن لە قۆناغەکانی نەشو نماکردنی بیری مرۆڤایەتی بێ کە قۆناغی لاهوتیەتەو ئۆگست کونت لە بەدەم (وەضیعە) نویکەرەوەکاندا پێناسەی کردوە لە یاسای سێ دۆخی -- خرافەو ئەندێشەو ئەفسانە -- دا داناوە کە ئەقڵ هەوڵی‌دا بەهۆیەوە دیاردەکانی سروشت لێکبداتەوەو بۆ ئەو هۆیانەی بگەڕێنێتەوە کە لە سەرووی دەسەلاتی مرۆوەنو لە ئەنجامی کردەوەو تواناى هێزە شارراوەکانەوە ڕوو دەدەن نەك یاسا سروشتیەکان . هەروەها ئەفسون دیاردەکانی جیهان یان سروشتی بە توندو تیژیو شەڕ لێك دایەوەو بۆ توانای گیانە چەپەڵو ئەهریمەکانی گەڕاندەوە ئینجا ئایین هاتو لە قۆناغە سەرەتایی‌یەکانی‌دا ئەم دیاردانەی بۆ دەسەلاتی خواوەندەکان گەڕاندەوە ، هەندێ جاریش دەیبردەوە سەر ئارەزووەکانیان ، وەکو ئەغریقەکان کردیان .

بە پێشکەوتنی بیری ئایینیو پەیدابوونی ئایینی پێشکەوتوو تر ئەو ئایینانەی پێ لەو شتانە ڕزگارکرد کە چوو بوە ناویەوە ، لە قۆناغە سەرەتایی‌یەکانی‌دا لە چەمکی ئەفسونو تقووسەکانی دوورخستەوە ، لە قۆناغەکانی دواییشیدا لە ڕوانینی ئەفسانەیی دوورخستەوە . ئەقڵ بەسەر جیهانو بوونی ئادەمیزاددا ڕژێمێکی مەنتیقی ئاقڵانەی سەپاند ، لە سەرەتادا دانی بە پەندی بەرزو خێری ڕەهاو جوانی تەواوی ناو کانگای خوڵقێنراوەکاندانا ، هەروەها بوونی شەڕو توندو تیژی ناو جیهانی بە یاخی‌بوونی ئەهریمەن لە خوا لێکدایەوە ، بەمەش شەڕێکی ئاشکراو ڕوون دەستی‌پێکردو گۆڕە پانەکەیشی هەموو جیهان بوو کە تەواو بوونی نی‌یە تازەمانە تەواو نەبێت لە نێوان خێرو شەڕ -- خواو ئەهریمەن‌دا ، ئەمەیان لە ئاسمان . لەسەر زەویش هەر لە سەرەتاکانی چاخی ناوەڕاستەوە ، هێرشی توندو تیژ دژی

ئەفسونو ئەفسونگەران دەستی پیٚ‌کرد . بەم جۆرە بە ئەندازەی کڵپەی ئەو هێرشانەی بت پەرستانی جیهانی کۆن تاوی سەندبوو . ئەوە بوو ئەم هێرشەش شێوەیەکی ڕەسمی وەرگرت کە بریتی بوو لە بەگژ یەکا چوونێکی درێژخایەنی مەترسیداری نێوان قەشەکانو ئەفسونگەران . ئەوە بوو پاپا ئەسکەندەری چوارەم یاسایەکی پاپایانەی لە ڕۆژی سێزدەی دێسەمبەری ١٢٥٨دا دەرکرد بۆ دامەزراندنی یەکەمین (دادگای تەفتیش) لە جیهانا بۆ لە ناوبردنی کوفرو گومرایی لە لایەکو «پەتای ئەفسونگەران» لە لایەکی ترەوە . بەڵام ئەو پەتایە ڕۆژ بەڕۆژ برەوی سەندو ، بڵاوبووەوە تا سەردەمی پاپا ئەینۆسنت 1innocent ی هەشتەم واتە (بیٚ گوناە) کە مانیفستوێکی پاپایانەی توندو تیژی بۆ وولاٰتانی ئەوروپا دەرکرد ، تیاییدا داوای کۆمەکی کرد تاکو بکەونە فریای کڵێسای مەسیح دژی مەترسی «دەردە شەیتان» .

ئەوەی کە قوڵیو مەترسی ئەو زۆرانکاریە سامناکە ڕوون دەکاتەوە کە چەند سەدەیەکی تەواوی خایاند لە نێوان کڵێسای مەسیحو کڵێسای ئەهریمەن — ئەگەر ئەم دەربڕینە گونجاو بیٚ ! ئەو گرنگی پێدانە بیٚ هاوتایەی کاربەدەستانو پیاوماقوڵانی کڵێسای کاسۆلیكو کاردیناڵە گەورەکانیانی بوو کە چەندەها لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلیان سەبارەت بە پەتای سیحرو سیحربازیی کە لەو سەردەمانەدا بڵاوبووبووەوە ، نووسی ، بە پەیڕەوکردنی ڕێبازی «دوژمنی خۆت بناسە» .

چۆن لە هەموو ڕژێمێکدا دووبەرەکیو جیابوونەوە هەیە ، لەو ڕژێمەی کە مەسیحییەتیش سەپاندیە سەر ئەقڵ لە ئەوروپادا چەندەها کەس یاخی بوونو لیٚ‌ی جیابوونەوە ئەوانەش ئەوانە بوون کە وەسفیان کردن (بە ڕۆح ئاژاوەچی) ئەوانەی بە درێژایی مێژوو وازیان لە بۆچوونە سەرەتاییەکانی مرۆڤ نەهێنا کە بواری شەڕو توندو تیژی ئەدەنو وای بۆ ئەچن کە لە ڕەگو ڕیشەوە لەگەڵ دروستبوونی بوونەوەردا هاتوونو ، لە فەرمایشتەکانی فەلسەفەو خێرو جوانی کە کۆڵەکەی ئەو ڕژێمە بوون هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنەری ئەوتۆیان چنگ نەکەوت وازیان لەخۆ ڕێکخستن پیٚ بهێنێت لەگەڵ ئەهریمەنەکانو بۆ چوونەکانیاندا چ بەرەت کردنەوەیان ، یان بەربەرەچ‌دانەوەیان ، یان یاخی‌بوون لێیانو ، یان ئارەزوو کردنی زاڵبوونو زانین . یەکێك لە بەناوبانگترین ئەو یاخی‌بووانە ، دکتۆر (فاوست)ە ، (د — فاوست)ی هاوپەیمانی شەیتان . د . فاوست کەسێکی خورافی دروستکراوی خەیاڵ نیە ، بەڵکو لە ناوەندی یەکەمی سەدەی شازدە ، لە خوارووی ڕۆژ ئاوای ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی ، لە ناوچەی ساکسۆنیا ، باکوری ڕۆژ ئاوای ئەڵمانیا پزیشکێك یان حەکیمیٚ بووەو ژیاوە . هەندێك بە زانای ناو دەبن ، هەندێکی تر بە ساختەبازو دەستبڕ ، بە لەخۆ باییو غەرڕا درایە قەڵەم ، تاوانباریان کرد بە تێکەڵاوی شەیتانو ئامادەکردنی گیانی مردووەکان ، بە ناوی جۆرج یان «حەننا» فاوست ناسرا .

لەوانەیە کابرا بە زانینو فرە زیرەکی پێش سەردەمی خۆی کەوتبیٚ قینو ئیرەیی هاوچەرخەکانی بە فیزو شانازیو پۆز لێدان بە سەریاندا ووروژاندبیٚ ، بەوە تاوانباریان کردووە کە سیحربازو هاوپەیمانی شەیتانەکانە .

زانست لەو سەردەمانەدا ، جگە لەوەی پیاوانی کڵێسە ڕێگایان دەدا تا ماوەیەکی درێژیش لە بیری خەڵکەکەدا بەشتێکی نزیك لە ئەفسونو موعجیزە دادەنرا .

لەو کتێبانەی دادگای تەفتیش دەستی بەسەرا گرتو قەدەغەکرا کتێبی (ئەهریمەنی سوور) بوو ، گوایە سیحر بازێك فێڵی لە شەیتان کردووەو لیٚ‌ی ستاندووەو چی تیا نووسراوە خوێندوویەتەوەو فێری بووە ، کتێبەکەش بریتی بووە لەناوی کۆمەڵیٚ داودەرمانی چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی ڕەشە ولاٰخو هەندیٚ ڕێنمایی‌کردن بۆ زێد کردنی پیتو فەڕی زەویو پەرەپێدانی سامانی ئاژەڵی ، کە زیاتر لە کتێبەکەی هزیود (کارو ڕۆژگار) دەچیٚ . بەڵام ئەقڵی هیلینی لە کویٚو ئەقڵی قەشە لە کویٚ ؟ ! ئەوەبوو بەپەلە کتێبەکەو خاوەنەکەی کە فێڵی لە



شەیتان کردبوو سوتێنران ، ئەو کتێبە زیانبەخشەی کە لە دادگای پیرۆزدا تاوانبار کرا بەوەی کە هێندە زانین دەبەخشێ بەو کەسەی بیخوێنێتەوە کە بۆ وەڵام دانەوەی هیچ پرسیارێك دۆش دانەمێنێت ، نەك هەر ئەوە بەڵکو لەو سەردەمەدا کە کڵپەی برواو ئیمان لە نێڵە نێڵ‌دا بوو وا بلاوبوبۆوە کە پاپا سیلفستری دووەم هێندە شەیدای زانیاری بووو لە زانین‌دا وا پێش سەردەمی خۆی کەوتبوو کە تاوانبار کرابوو بەوەی بەردەوام پەیوەندی لە تەك گیانە پیس‌و شەیتانەکان‌دا هەبووە تا ئەو رادەیەی لە گەڵ شەیتانی خودی خۆیدا تێوەگلاوەو گیانی نەمری خۆی پیێ فرۆشتبوو بە نرخی ئەو فرە زانستەی کە لیێ وەرگرتبوو . لەوانەیە ئەوەی دراوەتە پاڵ فاوست کە شەیتان‌و سیحربازە شتێك بوویێ لەو نزیکەوە ، رەنگە بەراستی سیحرباز بوویێ ، بەهەر حاڵ راو بۆچوونی هاوچەرخەکانی جیاواز بوون‌دەربارەی .

بۆ یەکەمین جار کە ناووی فاوست هێنرا لە نامەیەکدا بوو کە لە لایەن قەشە حەننا تریتهایم گەورەی قەشەکانی خێڵی (بنیدکتین) واتە (پیرۆزەکان) بوو کە ناردبووی بۆ هاورێیەکی خۆی لە ساڵی ۱۵۰۷دا . وا دیار بود لە نێوان ئەو قەشەیە (کە لە دواییدا دەرکەوتوە ئەویش کۆنە سیحرباز بووەو دادگای تەفتیش کتێبێکی قەبەو زلی لە بواری سیحردا سووتاندووە)و فاوست‌دا نابەدڵی‌و دژایەتیەك هەبوە لەو جۆرە دژایەتیەی کە لەنێوان کەسانی هاو پیشەدا هەیە .

بۆیە تریتهایم لە نامەکەیدا (فاوست)ی بە جادووگەرو گەوج‌و ساختەچی‌و درۆزن داوەتە قەڵەم .

ئەو قەشە جادووگەرە تەنها کەس نەبووە لە هاوچەرخەکانی فاوست کە بەو وەسفانە وەسفی بکات . وەکو گوتمان فاوست بە ئەندازەیە لەخۆ بایی‌و رکونی‌و خۆ پەرست بووە کیێ زۆر خۆی بەسنگ فراوان زانیوە لیێ بێزار بووە . لەو حیکایەتانەی لیێ دەرگێرنەوە ، بەردەوام لافی ئەوەی لێداوە کە گوایە ئەگەر هەرچی کتێب‌و نووسراوی کەڵە فەیلەسوفەکانی کۆن هەیە کۆبکرێنەوەو بسوتێنرێن ، ئەم دەتوانێ سەر لەنوێ هەموویان بەرێك‌و پێك ترو زیرەکانە تر بنوسێتەوە بیێ ئەوەی خۆیشی ماندوو بکات . بەوەشەوە نەوەستاوە لافی ئەوەی لێداوە کە گوایە هەر هەموو ئەو موعجیزانەی دراونەتە پاڵ حەزرەتی مەسیح هیچ نین لەچاو ئەو کردەوە لە توانا بەدەرانەدا کە ئەم دەیکات (ئەگەر مەیلی لە کردنیان بێت) . بەڵام هاوچەرخەکانی فاوست هەر هەموویان لەسەر رەئی قەشە تریتهایم‌و پەیرەوەکانی نەبوون . زۆرێك لەو هاوچەرخانەی وەسفیان کردووەو بە زیرەکێکی لە ئاسایی بەدەریان داناوەو زانستێکی زۆریشیان داوەتە پاڵ ، هەرچەندە لەگەڵ زەمکارەکانیدا دەربارەی لە خۆبایی بوونی‌و ناهەمواری رەفتاری‌و دژوەستانەوەی بەرامبەر

نەریت‌و شتە پیرۆزەکان یەکیان گرتۆتەوە .

کورتەی قسە ، وا دەردەکەوێ فاوست وێنەیەکی زووی شەیتانەکانی سەدەی نۆزدەهەم بوو بێت‌و لەوە دەچێ مرۆڤێکی بەدبەخت بوبێ بەتاکە کەسێتی خۆی‌و بلیمەتی‌و یاخی‌بوونی لە یاساکانی سەردەمەکەی ، ئەو سەردەمەی کە نەزانین‌و ترس‌و قورداس گێرانی بێ‌سنوور بینەقاقای گرتبووو هەناسەی لەبەر بڕیبوو .

بەهەر حاڵ ، ڕا دەربڕین لە دەربارەی هەرچۆنێك بێت ، کابرا ژیانێکی پڕ ئاشوب‌و ئازاردراوی کورت (١٥١٠-١٥٤٠) ژیاوەو ئیتر وون‌بووەو هیچی دی دەربارە نەبیستراوە . دەشڵێن گوایە دواجار لە شەیتان یاخی بووەو هەوڵی داوە هەڵیخەڵەتێنێ‌و پەیمانەکەیان پوچەڵ کاتەوە ، ئەویش ملی باداوەو گیانی کێشاوەو لەگەڵ خۆیدا بردۆیتی بۆ دۆزەخ تا لەوێ بەکاوەخۆ هەق‌و حسابی خۆی لەگەڵدا بیرێنێتەوە فیکرەی پەیمان بەستن لەگەڵ شەیتاندا لەگەڵ تەشەنەکردن‌و زاڵ‌بوونی بەسەر بیرگەلدا لە سەدەی بارۆك‌و بەر لەویش بیرێکی کۆنی جولەکەیە ، لە بنەڕەتەوە سەبارەت بەوەیە کە گوایە لە سنوور تێپەڕاندن ، وەدەست هێنانی زاڵ‌بوون‌و زانین کە لە سەرووی توانای مرۆوەن لە ڕێگەی پەیوەندی‌کردن بە ئەهریمەنەکانەوە دەبێت . لەوەو پێش گوتمان کە تا ماوەیەکی درێژ چەمکی جادووو ڕەگەزەکانی‌و هەندێ لە تقوسەکانی خزابوە ناو ئاینەوە ، چاك ترین بەڵگەشیان ئەو نەریتی قوربانی‌و (شەعائیر)(٢) پێش‌کەش کردنەیە کە هەندێك لە قەشە جووەکان ئەوانەی بە سیحرباز ناسرابوون دەیانکرد کاتێك ئادەمیزادیان دەکردە قوربانی‌ی تا پەیوەندی بە (شدیم) واتە (گیان)ەوە بکەن‌و خراپترین‌و هیچ‌و پووچترینیان ئامادە بکەن کە (ساتانیم‌ی شەیتانی)یە Satanim ، ئەوەی کە ئاینی مەسیحی ووشەی ساتان Satanی لێوە وەرگرتوە کە مانای (شەیتان)ە .

هەر کەشیش گومانی لەم قسەیە هەبێ با (تلمودو(٣) قبالەو(٤) ئینوخ(٣)) بخوێنێتەوەو هەندێ لەو شەعائیرە خوێناویانەی ئەو ئاینە بکۆڵێتەوە کە لە بنەڕەتەوە لە سەر گریمانکاری (بوونی شەر لە خوڵقێنراو داو توندو تیژی‌و دەسەلاتداری‌و سزادان لە دروس کاردا) دامەزراوە ، کە پەیامبەرەکانی پێیان دەگوت «خواوەندی کینە ورق»و هاواریان لێ‌دەکرد هەڵبێ . لە لایەکی ترەوە ئاینی جولەکە باوەڕی قووڵی بەوە بووە کە پوختەی زانیاری‌یە مرۆڤایەتی‌یەکان لە جەوهەردا بێ خێرن . ئەو بیروڕایە ئاینی مەسیحیش لە ئاینی جولەکەی وەرگرت بەو پێ‌یەی کە سروشتی خوایی یان ئەو زانیاری‌یەی لە لایەن خواوە بێ‌و گیان قبوڵی بکا ، (چاکە) . بەڵام زانستی مرۆڤ (خراپە)یە چونکە هەوڵ دەدات بۆ ئەتك کردنی سروشت‌و گەردون‌و دەرك‌کردن بە نهێنییەکانیان . فاوستی بەسەرزمان هەر وەکو گۆرانی‌یە میللی‌یە سەرەتاییەکان‌و ئەو کارە شانۆگەریانەی لە دەوری داستانەکەی دەگەڕان ، دەری‌یان دەخست وانەبوو ، نە نەفرەت لێکراوو نە یاخی بووو نە

هاوپەیمانی شەیتان بوو ، بەڵام لەبەر ئەوەی زانیاری مرۆڤایەتی لە سروشتی خوایی پێ باشتر بووەو پشتی کردۆتە کتێبە پیرۆزەکان ، نەیویستووە بە دکتۆری لاهوت ناو ببرێ‌و سووربووە لە سەر ئەوەی ببێتە دکتۆری پزیشکی‌ی . . . هەموو تاوانی ئەوە بووە کە سووربووە لە سەر ئەوەی ببێتە مرۆو شت بزانێ نەك تەنها خوڵقێنراوێکی ڕووت‌و نەزان‌و هیچ لەباردا نەبوو .

یەکەم کتێبی بەچاپ گەیەنراو لەسەر فاوست لە فرانکفۆرت ساڵی ١٥٨٧ بە پێنووسی کۆکەرەوەیەکی نەناسراوە ، دەرچوو ، لەسەر ئەوەی دەربارەی ئەو شەخسیەتە هۆنرابۆوەو کەڵەکە بووبوو بنیاتی نا ، پشتی بەستبوو بەو داستان‌و حیکایەت‌و خورافیات‌و زێدە ڕۆیی (مبالغة)و گۆرانی‌یە میللی‌یانەی کە دەربارەی فاوست هەڵبەسترابوون . هەرکە کتێبەکە

دەرچو . . . هێندە ڕەواجی پەیدا کرد کە بلاوکەرەوەکەی (یوهان شبیز) دووبارە لە چاپی دایەوە ، ئەمجارەیان بەچاپێکی پوخت‌و پتر کراوەوە .

لە ساڵی یەکەمی بلاوبوونەوەی چاپی یەکەمیداو پێش ئەوەی چاپی دووهەمی بلاو ببێتەوە ، چوار چاپی دزراوی لیٚ بلاوبۆوە . لە هەمان کاتدا کە بلاوکەرەوەی ئەسلی چاپی دووەمی لیٚ دەرکرد ، نوسخەیەکی بە شیعر ڕێکخراوی لیٚ دەرچوو لە دوای ئەوە چاپی دەستکاری کراو بەرودوا ساڵ لەدوای ساڵ لە ئەلمانیادا دەرچو . تا ساڵی ١٥٩٩ (رودلف فیدمان) بەتێرو تەسەلی داستانەکەی نووسی‌یەوە ، بەلام نرخە درامی‌یەکەی نەك هەرکەم‌کردەوە بەلکو خەریك بوو بە ئیجگاری لای بەرێت‌و پی‌شێلی بکات‌و بایەخی زۆری بە ووتاری ئاینی‌و فەلسەفەی ئەخلاقی بدات . لەسەر بناغەی ئەو چارەسەری‌یە (یوهان بفتیزر) دووبارە حیکایەتەکەی نووسی‌یەوەو وەکو (فیدمان) پشتی بەگێڕانەوەی مێژوویی‌و فەلسەفەی ئەخلاقی بەست ، هەرچەندە ئەو وەك فیدمان دەست‌پێشکەری نەکرد لە شاردنەوەی ڕەگەزی بت پەرستی‌یە ئاشکراکەیدا لەو برگە تایبەتی‌یانەی ئامادەکردنی گیانی (هیلین) شاژنی یۆنانی‌دا کە بەهۆیەوە جەنگی (تەرەوادە) هەڵگیرسا . کتێبەکەی (بفیتزر) لە ساڵی ١٦٧٤دا لە (نیورمبرگ) دەرچوو ، تا ساڵی ١٧٢٦ شەش جاری تر لە چاپ درایەوە ، بەلام ئەوەی لە هەموان پتر بلاوبۆوە لەو دەمانەداو لەنێو جەماوەردا ڕەواجی هەبوو کتێبێك بوو «ئیماندارێکی مەسیحی» نووسی بووی ناوی نابوو (ئەو پەیمانەی د - فاوستی ئامادەکەری گیانان‌و سیحر بازیی جیهانی لەگەلٚ شەیتان‌دا بەستی)و ساڵی ١٧١٢ بلاوبۆوەو چەند جارێکی تریش لە چاپ درایەوەو ژمارەیەکی زۆریش لیٚ فرۆشرا هەر وەکو فرە لەو کتێبانەی کە لەنێو خەلکێکی زۆردا ڕەواجیان هەیە سەرکەوتنی ئەو داستانە تەنها لە ئەلمانیاو دەوروبەری‌دا نەبوو ، بەلکوپەری‌یەوە بۆ ئینگلتراو لە ساڵی ١٥٨٨دا بە ناووی (مێژووی ژیانی د- جۆن فاوستی نەفرەت لێکراوو ، ئەو مردنەی کە بەڕاستی‌ی شایانی بوو) بلاوکرایەوە . لەهەمان کات‌دا ، یان دوای ئەوە بەکەمێك لە دانیمارك‌و فەرەنساو هۆلندا لە ئەلمانی‌یەوە پەرچڤەکراو کەوتە بازارەوە ، ساڵی ١٦١٢یش لە براغ پەرچڤە چیکیەکەی بلاوکردایەوە .

وا دیارە هەموو ئەو وەرگێڕانانەی بۆ ئەو زمانە ئەوروپایانە هەموویان لە چاپی یەکەمەکەی (شبیز)ەوە وەرگێڕاون . .

وا دیارە هەر لە کۆنەوە داستان لای گەلانی هەموو جیهان خەیالی شاعیرانی وورووژاندوە . هەروەك چۆن لە ئەلمانیا ، دوا بەدوای چاپی یەکەمی (شبیز) بە شیعر دارێژرا ، هەمان شت لە زووربەی ئەو ولاتانەی پەرچڤەی تیا بلاوکرایەوە ڕوویدا ، شاعیرێکی میللی‌یان کەسێکی دی هەستاوەو بە شیعر دایرشتۆتەوە ، یەکێك لە بەناو بانگترین ئەو هەولدانانە ، گۆرانیەکی میللی ئینگلیزی بوە کە دەشیٚ (مارلو) لەو کاتەدا خوێندبێتیەوە یان بیستبێتی کە پەرچڤە ئینگلیزیەکەی چاپەکەی (شبیز)ی خوێندۆتەوە ، هەشن سوورن لەسەر ئەوەی کە گۆرانی‌یە میللی‌یە ئینگلیزی‌یەکە ئیلهامی لە شانۆگەریەکەی (مارلو)وە وەرگرتووە نەك گۆرانیەکە ئیلهام بەخشی شانۆگەریەکە بووبێت . بەهەر حالٚ . .

کریستوفر مارلو (١٥٦٤-١٥٩٣) کە تەمەنێکی کورتی فاوست ئاسا ژیاوەو ئەو تەمەنە کورتە پەشێوەی زۆر نالەبارو تالٚ کۆتایی هاتوە ، یەکەم شاعیری ڕۆژ ئاوایی بوو کە گرنگی بە کوێرەوەری ئەو یاخی‌بووە بە ڕۆح ئازاوەچی‌یەداو دەتوانین بلێین کە بە چارەسەری درامی لە خولگەی هەقایەتی گویٚ ئاگردان‌و لێکۆلینەوەی فەلسەفەی ئەخلاقی دەری هاوردووەو دەرگاکانی ئەدەب‌و هونەری بۆ والاٚ کردۆتەوەو وەك ڕەمز کەسانیٚ زۆر لە دوای خۆی بەکاریان هێناوە بۆ دەربرینی چەندین گۆشە نیگاکە هەموویان لە بنەڕەتەوە دەچوونەوە سەر

باخی بوون . له ڕاستیدا . . . شانۆگەری‌یەکەی (مارلو) کە کەرەسە خامەکەی لە بناغەوە لە پەرچڤە ئینگلیزیەکەی چاپی (شبیز) وەرگیرابوو ، لە کۆتایی سەدەی شازدەو سەرەتای سەدەی حەڤدەم‌دا گەیەنرایە ئەڵەمانیا بەهۆی ئەو تیپە شانۆی‌یە ئینگلیزیانەوە کە لەو کاتانەدا بۆ چەندین جار سەریان لە ئەڵمانیادا .

ئا بەو شێوەیە (کوێرەوەری دکتۆر فاوست) ئەوەی کە (مارلو) نووسیبوی هەرچەندە لە دەقێکی ئەڵەمانی وەرگیرابوو لە شێوەی کارێکی هونەریدا گەڕایەوە بۆ شوێنی لە دایك بوونی ڕەسەنی خۆی ، بێگومان کارێکی گەورەشی کردە سەر کانگای خەیاڵی ئەڵەمانی‌و بوە خاڵی دەسپێکردنی ڕاستینە بۆ زۆرێ لەو داهێنانە هونەریە ئەڵەمانیانەی دەربارەی ئەو پاڵەوانە ئەفسانەییە نوسرا .

ئەو بەرهەمە هونەریانەش بە ژمارەیەك درامای میللی‌و شانۆگەری بووکە شوشەیی – کە زۆربەیان دەقەکانیان تۆمار نەکراوون – دەستی پێکرد کە زووربەیان سەرپێ‌یی دەوترانەوە بەڵام ئیلتیزامیان بە هێڵە سەرەکیەکانی دیمەن‌و ڕواڵەتی درامی‌یەوە هەبوو . (شاییل) لە کتێبەکەی‌دا (خەڵوەت خانە) ، ئەوی ساڵی ١٨٤٧ بلاوکرایەوە ناوی دەقێکی شانۆیی فرە باڵای یەکێ لەو هەوڵە درامی‌یە سەرەتایی‌یانەی هێناوە کە بە دەق (ئولم) ناسرا ، هەروەها (هام ١٨٥٠–١٨٩٨) ژمارەیێ لە دەق شانۆگەری‌یە شوشەییەکانی بلاوکردەوە .

بەڵام یەکەم گرنگی پێدانی ڕاستینە بە داستانەکە لە لایەن کەڵە نووسەرو ئەکتەرەکانی شانۆی ئەڵەمانی‌یەوە ، لەلایەن (جوتولد ئەفرایم لینج ١٧٢٩–١٧٨١)ەوە بوو ، کە ڕەخنەگرو شانۆگەری نووسێکی سەر بەقوتابخانەی کلاسیزمی نوێ بوو ، ئەو قوتابخانەیەی کە بوە هۆی بەرپابوونی (چاخی ڕووناك کردنەوە) لە ئەدەبی ئەڵەمانیدا . ئەو ڕووناك کردنەوەیەی کە شۆڕشێکی‌فکری بوو بەسەر دەمارگەی ئایین‌و زاڵیتی کەنیسەی ڕۆمادا لەبەر ئەوە شتێکی



ئاسایی کە فاوست سەرنجی ئەو نووسەرە درامی‌یەی ڕاکێشایێ ، ئەوی دەتوانین بڵێین کە یەکێکە لە لاکانی سێ کوچکەی یاخی بوون کە دوولاکەی تری (مارتن لوثر)و (فریدیرك شیللر)ن .

لسینج لەو بڕوایەدا بوو کە لە سەردەمی ویدا دەتوانرێ ترازیدیا لەسەر ڕەوشتی یۆنانی‌و ئەلیزابیسی ببوژێنرێتەوە ، بەڵام بڕواکەی وەك بنەمایەکی ڕەخنەیی مایەوەو لە کارە درامی‌یەکانیا ساغی نەکردەوە . دوای لسینج ، فریدیرك ماکسیملیان کلینجر ١٧٥٢–١٨٣١ بە ڕۆمان چیرۆکی (فاوست)ی نووسی بە ناونیشانی (ژیانی فاوست‌و مردنی‌و دابەزینی بۆ دۆزەخ) ساڵی ١٧٩١ دەرچوو . هەروا (لێناو) داستانەکەی وەك مەلحەمەیەکی درامی بە ناونیشانی (فاوست) نووسی‌و ساڵی ١٨٣٦ بلاوی کردەوە .

دوای ئەوە کرا بە ئۆپرێیت . مۆزیقاکەی (شبور) دایناو دەقە لیریکی‌یەکەی لە ساڵی ١٨١٤دا (برنارد) نووسی . ساڵی (١٨٥١)یش لە لایەن (هاین)یەوە کرا بە باڵیت بە ناونیشانی (دکتور فاوست – شیعرێکی سەمائامێز) .

بەڵام گرنگترین کاری هونەری کانگای خەیاڵی شیعری ئەڵەمانی– دایهێنابێ . کارە باڵاکەی گوتەیە . ئەوی ناوی (فاوست FAUST)ە . شاعیری گەورە لە سەرەتای ساڵی ١٧٧٤ دەسی‌کردە نووسینەوەی‌و ساڵی ١٨٠٨ لە بەشی یەکەمی بۆوەو دوایی لە ساڵی ١٨٣١دا بەشی دووەمی تەواوکرد .

لە سەرەتای (فاوست)ەکەی (مارلو)دا کۆرس بەچەند دێرێکی بت پەرستانەی وا باسی پاڵەوانەکە دەکەن کە بەئاشکرا هەستی پێ دەکرێت . . .

وەك :

ئەو . ئەو ئادەمیزادەیە کە هەوڵی‌دا بە دوو باڵی مێوین بە ئاسماندا بفرێ‌و سنووری خۆی بەجێ بهێڵێ .

ئاسمان پیلانی لی‌کردوو هەردوو باڵەکەی سووتاند . بۆ ئەوەی بیخاتە خوارەوە . هەمای میثۆلۆجی روونە لە مەداو ئاشکرایە کە ئیشارەیە بۆ ئیکارۆسی لاو ئەوی هەوڵی‌دا بە هۆی دوو باڵی مێوین‌و پەڕەوە بەرزبێتەوە بۆ ئاسمان بەڵام (ئولیمب)ی خواوەند باڵەکانی سوتاندو لە ئاوا خنکاندی . گومانێکی هەمیشەیی دەربارەی ئایین‌پەروەری (مارلو) هەبوو هەندێ لەوانەی ژنامەکەیان نووسی‌یەوە هەوڵیان دا بیگەڕێننەوە بۆخەریك بوونی بە کاروباری رامیاری ئایینی‌یەوە بۆ حیسابی شاژنە (ئەلیزابیث) دژی کەڵێسەی کاسۆلیکی ، ئەو کڵێسەیەی وویستبووی شاژن لەناوبەرێت . بەڵام (مارلو) لە هیچ کاتێکدا درێغی نەئەکرد لە یەکەم تەماشاکردنی ئایین ، تا ئەو سنوورەی موحازەرەی دەربارەی نەبوونی خودا دەدا ، دوای ئەوە بە تۆمەتی کوفرکردن حوکم‌درا دادەوەرەکانی هەوڵیان‌دا کە بەدناویشی بکەن ، تۆمەتی هۆمۆ سێکسی یان دایە پاڵی .

بەڵام ئیتر سا بەهۆی زمان ڕەوانی خۆیەوە بووبێت یان بەهۆی کار گوزاری‌یەکانی‌یەوە بووبێت بۆ شاژن توانی پاکانە بۆ خۆی‌و خۆی دەرباز بکات ئەوەبوو پاش ئەوەی دادوەرەکان بەتوندی ئامۆژگاریان کرد کە ڕێگای ڕاست بگرێ . بە نابەدڵی‌ی بەرەڵلایان کرد .

بەهەر حاڵ . بە بڕوای ئێمە ، ئەو شاعیرە درامی‌یە مەزنە . ئەوی وێك چوونێکی زۆر لە نێوان ژنامەکەی‌و ژنامەی جان جینەی ئەم چەرخەماندا دەبینین . نزیکتر بوو لە بت پەرستی وەك لە ئایینی مەسیحی . چ کاسۆلیکی بێت یان پرۆتستانتی ، ئەو بۆیە گرنگی‌ی بە (فاوست)داو کوێرەوەری‌یەکەی نووسی‌یەوە تەنیا بۆ ئەوەی هەندێ بیروڕای بت پەرستانەو یاخی‌بوون دژی ئایینی مەسیحی دەربڕێ . باڵاترین دیمەن لە شانۆگەری‌یەکەیدا کە ئەوە دەسەلمێنێ . دیمەنی ئامادەکردنی گیانی هیلین‌و سۆز دەربڕینی فاوست – ە بۆی . . .

ئەی هیلینی جوانکیلە . بە ماچێکت نەمری‌و جاویدانیم پێ ببەخشە .

بەو پەیمان بەستنەی لەگەڵ شەیتاندا . وازی لە نەمریی مەسیحی مسۆگەرکراو کە ئایین وەعدی پی‌دەدا هێناو لە پێناوی نەمریی شاعیرانەدا . ، بت پەرستی‌دا . کە چێژو تامێکی مرۆڤ پەروەرانە دەدات . بەهەر حاڵ ئەو هەر لە سەرەتاوە وا بریار ئەدا :

گەر بە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان گیانم لە بەرا بوایە هەموویانم ئەدا بە میغیستولیلیس .

بۆچی ؟ ئەوێك کە خۆی ووتویەتی «ئەم ووشەی نەفرەتە . . ترسم دەوروژێنێ» چونکە ، وەك لەو چەند بەیتەی دوایی‌یەدا دەڵێ ، لەو دۆزەخەدا کە ئایینی مەسیحی هەرەشەی پێ دەکات (یزیوم)ی میسۆلۆجیای یونانی‌یان (بەهەشتی پیاوچاکان)ی سەردەمی بت پەرستنی ئەغریق – هەیە .

«لەوێ گیانم لەگەڵ گیانی فەیلەسوفە کۆنەکاندا دەبێت» .

لە هەمان کاتیشدا ، چونکە دەربەستی ژیانی ئەم سەر

زەمینەی بوەو وویستوێتی سەرانسەری دووربێت لە بەندایەتیو فەرزکردنی ئەخلاقیاتو دابو نەریتی ئاینی مەسیحی ، بۆیە نەك گیانی خۆی فرۆشتوە بە شەیتان لە پێناوی ژینی سەر زەمینی داو بەس ، بەڵکو لە پێناوی دوای مردنیشیدا . کاتێك کە بە ڕەزامەندی خۆی دۆزەخ هەڵدەبژێرێتو بەهەشتی مەسیحیەتیش ڕەفز دەکات . لە چەند بەیتێکی ئەو نامەیەیدا کە بۆ پەیمان بەستنو ڕێککەوتن بۆ شەیتانی نووسیبوو فاوست دەڵێ :

بڕۆ ئەم هەواڵە بەرە بۆ لۆسیفەری مەزن

پێی بڵێ بەو بیرۆکە نائومێدانانەی کە شالاوی پێ دەبردە سەر خوایەتی ئاسمان فاوست مردنی هەمیشەیی بۆ خۆی مسۆگەر کردووە .

پێی بڵێ فاوست ڕۆحی خۆیی ئەداتێ

بەرابەر بە بیستو چوار ساڵ ژیان لەسەر ئەرز

کە لۆسیفەر وای لێبکات لە خۆشی‌یەکی بێ سنووردا بژی

– ئەی شەیتان – واش لە تۆ بکات ببیە خزمەتکارمو لێم جیا نەبییەوە هەموو ئارەزووەکانم بێنیتەدیو وام لێبکا چیم بوێ بیزانم دوژمنەکانم بکوژیو بەتەنگ هاوەلاتمەوە بیو

هەردەم ، گوێڕایەڵی خواستنەکانم بیت .

دەتوانرێ بووترێ نائومێدی وای لە فاوست کردو فڕێی دایە باوەشی شەیتان ، گوایا مادام ژیان شتێکی دۆڕاوە کە مرۆ هەرچەند بکۆشێ ناتوانێ خۆی لە نەفرەت قوتار بکات . . . چی دەبێت با ببێت ، دەبا مرۆ هەر لە سەرەتاوە ڕێگا کورتکاتەوەو بچێ بۆلای شەیتان ، بەڵام ئاخۆ ئەو نامەیەی فاوست بۆ شەیتان ، ووشە بە ووشەی ئەوانە نین کە جادووگەرە کۆنەکان پێش پەیدابوونی ئایینی مەسیحی ، بگرە پێش قۆناغی بت پەرستیش دەیان ووتەوەو دژکاری ئەو پەیمانە مەسیحی‌یانەیان ئەکرد کە مژدەی ڕزگار بوونی ئەداو بەرجەستەی خەنە کۆنەکانی مرۆڤ بە (خۆشیو زانینو دڵنیاییو زاڵ بوون) یان دەکرد ؟

دژوارترین شت لەکارەکەی (مارلو)دا ئەوەیە کە لە هەندێ کاتدا بەرامبەر ڕەوشتەکانی سەردەمەکەی سڵەمیوەتەوەو لە کۆتاییدا لە یاخی بوونی پاشگەز بۆتەوەو بەرەی پرۆتستانیەتی گرتوەو بەو جنێوو ووتە نالەبارانەی بە کڵێسای ڕۆمای ووتوە ڕازیی کردوە . . پاڵەوانە تراژیدیەکەی لە بەرگی گەوجێکدا دارشتوە کە تا کە ساتێکی بەرەلایی یاخی بوون زۆری لەسەر کەوتوەو زیانێکی قورسی لێداوە . با گوێ لەو پاڵەوانە بگرین کە لە سەرەتاوە دەیووت ئەگەر بە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان گیانم لەبەرا بووایە هەموویانم ئەدان بە شەیتان ، با گوێی لێبگرین بزانین لە دوا ساتەکانی ژیانیدا ، کاتێك وەك تاوانبارێکی بەر پەتی سێدارە قسە لەگەڵ خۆیدا دەکات بزانین دەڵێ چی ؟

ئاخ ئەی فاوست

ئێستا لە ژیانتدا هیچ شتێك لە پێشت نەماوە ، تەنیا تاقە سەعاتێك نەبێ تێیدا بژیت . . .

ئینجا دەبێ ڕو بەڕووی نەفرەتی هەمیشەیی ببیەوە .

گوتە شانۆگەری‌یەکەی لە سەرەتاوە بەدیمەنێ لە ئاسمان دەست پێئەکا ، تیایدا مفیستوفیلیس داوا لە یەزدان ئەکا ڕێگەی بدات فاوست بخاتە تۆڕی خۆیەوەو گیانی بکێشێ ، کردگار ئەو ئیزنەی پێ ئەبەخشێ بۆ ئەوەی بۆ مرۆڤ بسەلمێنێ کە هەرچەندە ئینسان وەك فاوست برسیی زانستو خۆشییو زاڵ بوون بێت ئەو غەریزەیەی هەر هەیە کە دواجار ڕێنمایی دەکاتو دەیخاتە سەر ڕێگای ڕاست .

دوای ئەوەی شەیتان فاوست لە خشتە دەباتو پەیمانەکەیان دەبەستن ، فاوست واز لە گیانی خۆی دێنێ بۆ شەیتان بەرامبەر ساتە وەختێك خۆشیو کامەرانی بێ گرێو گۆڵ .

بەشی یەکەم لە شانۆگەری‌یەکە دەزبارەی فریودانی کیژۆڵە (مارگریت)ە لە لایەن (فاوست)ەوە بە یارمەتیی شەیتان –

بەلاَم نازانین بۆچی پێویستی بەگەورەی ئەهریمەنانە بۆ فریودانی
- . بەلاَم رۆمانسیەتیەکەی گۆتە کە لە (ڤارتەرەوە) لێ ی جیانەبۆتەوەو چیرۆکی ئەو خۆشەویستی یەی کە بە کارەسات کۆتایی دێ (فاوست) (فالنتینی) برای کیژە بە یارمەتی ی شەیتان ئەکوژێ ، کیژە لە تاودا ئاوەزی دەدۆڕێنێو منداڵە ساواکەی بە دەستی خۆی دەکوژێو بۆ خۆیشی بە مردنێکی بەدبەختانە کۆتایی بە ژیانی دێت .

بەلاَم بەشی دووەمی دەربارەی چیرۆکێکی تری خۆشەویستی یە لە نێوان فاوستو هیلین دا کە لە جیهانی مردووەکانەوە بە یارمەتی هاوپەیمانەکەی ئامادەی ئەکا . . بەرهەمی ئەو خۆشەویستی یە منداڵێك دەبێ ناووی دەنرێ (یوفوریون) کە هێندە ناخایەنێ وەك دووکەڵ بە هەوادا دەچێ . . . ڕووداوی سەرەکی لەم بەشەدا – (خۆشەویستی هیلینو فاوست) -- لە نێوەندێکی پڕ لە سەرچڵیو پیلان گێڕانو خەفیە گیریو شەڕدا ڕودەدا تا دەگاتە لوتکەو دۆزەخ لەسەر شانۆ دەم بۆ فاوست دادەپچڕیو چاوەڕێ ی فاوستی دۆڕاوو نیگەران دەکات کە دەستی لە بنی هەمانەکەوە دەرچووەو بێ ئەوەی تامی ساتە وەختێك ئاسودەیی و خۆشیش بکات . هەر چەندە دەرکی بەوە کرد ، هەر وەك یەزدان چاوەڕوانی بوو کە شادومانی ی ڕاستینە لە لەزەتە هەست بزوێنەکانو یان جیهانی بەر فراواندا نیە ، بەڵکو لە یارمەتی دانی کەسانی ترو وازهێنان لە خود پەرستیدایەو کە دەرك بەوانە دەکات سەرفراز دەبێت . لە جیاتی ئەوەی ڕۆحیانەتی بچێت لە ناخی دۆزەخدا نقووم ببێت ، هەڵئەکشێ بۆ ئاسمان . بێ لە (مارلو) و (گوتە) لە شاعیرو هونەرمەندە گەورەکان زۆری تر چارەسەری داستانەکەی فاوستیان کردووە : بایرونو براوننك بە شیعر ، هکتور برلیوز بە مۆزیقا ، بێلەوان زۆر لە هونەرمەندانی تر لە بوارەکانی مۆزیقاو دراماو بالێو شیعرو شانۆی گەپجاریو کۆمێدیو نمایش ی ، چارەسەری یان کردووە . چارەسەری داستانەکە لە چەرخی ئیلیزابیسی بە پێنووسی مارلۆو ، لە چەرخی ڕۆمانسیزمدا بە پێنووسی گوتەمان دەرخست ، پاشان شاعیری رەمزی ی مەزن (پۆل ڤالیری)نوسیویەتیو لە گۆشە نیگایەکی هاوچەرخانەوە ڕوانیویەتیە داستانەکەو زۆر لە (گۆتە) نزیك بۆتەوە بەلاَم بەداخەوە تەواوی نەکردووەو ، گیرو گرفتەکەی (فاوست)ی گەڕاندۆتەوە بۆ سەرچاوە دێرینەکەی خۆی کە (ئارەزووی زانینە)ە ، ئارەزووی زانستو پێویستی بوونی خۆشەویستیو دڵسۆزی ی تێکەڵ کردو لە ئاستێك دانیان کە نرخێکی وا بدەن مرۆ لە پێناویاندا گیانی بفرۆشی ، کەچی لە دوا دواییدا پاشگەز بۆوە یان لەوانەیە بێزار بوویێتو وەك عادەتی خۆی خۆی لێ دزی بیێتەوەو ئەو کارە مەزنەی بە ناتەواوی جێهێشتو تەواوی نەکرد .

لەوانەیە چاکی کردبێو ، لە ڕاستیدا چ کۆتایەکی بنەبڕکەر یان بنەتای کۆتاییێ کە خەیاڵ دەتوانێ بیسەپێنێ بەسەر ئەو گومراهی یە هەمیشەیی یەو ئەو مل ملانێ سێ کوچکەیە کە لە سەرەتای پەیدابوونی خوڵقێنراوەوە تا ئێستا لە نێوان خواو . شەیتانو مرۆدا دەسوڕێ ، مەگەر گومراهی بە مانەوەیی واز لێ بهێنێو مل ملانێش هەمیشە هەڵگیرساوو بێ کۆتای بێ .

ڕوونکردنەوە

١ - ئەفسون سحر . جادوو
٢ - شەعائیر (شعائر) هەموو کردەوەیەکی ئاینی یا مەزهەبی یا نەتەوایەتی .
٣ - تلمودو إینوخ دوو کتێبی ئاینی ی جوولەکەن بریتین لە دەستوورو ڕێبازەکانی ئەو ئاینە .
٤ - قباله هەر کارێکی ئاینی یا مەزهەبی مرۆ ئیلتیزام بە جێبەجێ کردنیەوە بکات . ناووی کتێبێکی ئاینی ی جوولەکەشە . .

سەرچاوەکان

١ - گۆڤاری (البیان)ی کوێتی ژمارە ١٠٥ی ساڵی ١٩٧٤ لاپەڕەی ٣١-٣٦ .
٢ - گۆڤاری (الثقافة الأجنبیة)ی عێراق ژمارە ٣ی ساڵی ١٩٨٣ لاپەڕەی ٢٣٩ .
٣ - معجم المصطلحات الدرامیة والمسرحیة د - إبراهیم حمادة لاپەڕەی ١٢٧ و ٢٤٩ .
٤ -
٥

American Literature, tr . Julia Franklin
New york , Doubleday , Co 1915 . P 122 – 114
GOETHES FAST Parts 1 AND 11
P – Vi – Xii



### کونگرەیەکی گەورەی ئەدەبی لەبەغداد :

بە سەرپەرشتی بەرێز سەرەکی فەرماندە صدام حسین لەناوەراستی مانگی ئاداردا لە شاری بەغدادی پایتەختدا مامۆستا لطیف نصیف جاسم وەزیری رۆشنبیری‌و راگەیاندن پانگزەهەمینی کونگرەی ئەدیبانی عەرەب‌و حەڤدە هەمینی میهرەجانی شیعری کردەوە بە وتارێك کەتیایدا سلاوی سەرکردەی گەلی عیراق صدام حسینی بە بەشدارانی کونگرەکە راگەیاند . لەم کونگرەیەدا کە بێجگە لە نوێنەرانی یەکیتی‌یە ئەدەبیەکانی عەرەب وەفدی یەکیتی نووسەرانی ئاسیاو ئەمەریکای لاتینی‌و یەکیتی سۆڤیەت‌و هیندستان‌و چیکۆسلۆڤاکیاو کوبای تیا بەشدار بوون‌و بۆ یەکەمجاریش زیاتر لە ٣٠ ئەدیبو نووسەری کورد بەشداری‌یان تیادا کرد .

لەماوەی رۆژانی کونگرەکەدا لە ١٧وە بۆ ٢٣ی مانگی ئادار رۆژنامەیەکی رۆژانە دەردەچوو کە دەنگوباسی کونگرەی بلاو دەکردەوە .لە رۆژانی ٢٢و ٢٣دا بەشدارانی کونگرەکە سەریان لە شاری بەسرەدا .




## چاپکراوی نوێ

### رۆشنبیری نوێ

ژمارە ١٠٩ی گۆڤاری «رۆشنبیری نوێ» کە گۆڤارێکی وەرزی تایبەتە بەلێکۆلینەوە دەرچوو ، ئەم گۆڤارە کە لەدەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی دەردەچێت‌و دەستەی نووسەرانی لەکۆمەلی پسپۆری شارەزا پێك هاتووە لەلایەن هەموو زانکوکانی ولاتەوە باوەرنامەی ئاکادیمی پێدراوە . لەم ژمارەی دوایی‌یەدا چەندان باس‌و بابەتی بەسوودی تیا بلاوکراوەتەوە کە لایەنەکانی رۆژنامەگەری‌و میژووو ئەدەبو زانیاری‌و زمانەوانی‌و بیرەوەری‌و کەلەپوورو هونەری گرتۆتەوەو ژمارەیەکی دیار لە نووسەرو رۆشنبیرانی ئەمرومان بەشداری‌یان لە نووسینی بابەتەکانیدا کردوە ، بێجگە لە بەشی جەنگ‌و رامیاری کە لەپێشەوەی گۆڤارەکەدا بلاوکراوەتەوەو ئەم گۆڤارە لە چاپخانەکانی «دار الحرية» لە بەغداد چاپ دەکرێت .

### بۆ هەر نڤیسەڤانەکی گولەك

ژمارەی ١٣٤ لە زنجیرەی چاپکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی لە بەغداد کتێبێکی ئەدەبی نووسەر حجی جعفرە کە بریتی‌یە لە چەند بابەتێکی ئەدەبی هەمەرەنگ‌و وەك نووسەر خۆی لە پێشگرتنەکەیدا دەلێت (ڤی نڤیسینێ ژگەلەك رەزا بارێ خوە داگرتیە ژگەلەك زەڤیا بێدەرا خوە کوم کریە) . کتێبەکە بریتی‌یە لە ١٥٢ لاپەرە .

### «افاق عربية»

لە دەزگای کاروباری روشنبیری گشتی ژمارەیەکی نوێی گۆڤاری «افاق عربية» دەرچووە ، لەم ژمارەیەدا چەندان باس‌و بابەتی سیاسی‌و ئەدەبی‌و میژووی بلاو کراوەتەوە کە لایەنەکانی ژیانی سیاسی‌و روشنبیری ئەم رۆژگارەیان گرتۆتە خۆ بێجگە لەبەشی تایبەتی باسەکانی : گفتوگۆ کە لەگەل ژنە نووسەری هیندستانی ئەنیت دیسای کراوەو نامەی رۆشنبیری لەندەن‌و مۆسکۆو پاریس‌و جەزائیرو هتد . .

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

## هەولێر

دژوار : ئامادەی کردووە

### چیرۆکی کوردی

(چیرۆکی کوردی لەدوای داستانی مەم‌و زینی ئەحمەدی خانی‌ی ئەمرو بەرسیسی عابدی فەقێ تەیران . دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم بۆ دەست نیشانکردنی سەرهەڵدانی چیرۆکی هونەری کوردی . سەرەتا پێشبرکێ‌ی گۆڤاری پێشکەوتن کەوا لە ئۆکتۆبەرو نۆڤەمبەری ١٩٢٠دا شیعرێکی شێخ نووری شێخ سالح‌و پەخشانی زەکی سائیب‌و جەمیل سائیب پاداشتیان لەسەر وەرگرت . هەروەها مامۆستا علاءالدین سەجادی چیرۆکی باڵی‌و بارامی لە مێژووی ئەدەبی کوردی‌دا -١٩٥٢- بە یەکەم چیرۆکی داناوە .

دکتۆر کەمال مەزهەر دوو پەردە پیەسی مەمی ئالان لە نووسینی ع . ڕەحمی وانرخی دەداتێ کە بتوانرێ بە سەرەتای چیرۆکی کوردی دابنێین . ئەمەش لە پارچەیەکی تری کوردستاندا لە ساڵی ١٩١٨-١٩١٩ لە ڕۆژنامەی ژین لە ئەستەمبۆل‌دا دەرچووە ، هەروەها چیرۆکی شەویش لە نووسینی فؤاد تەمۆ کەوا لە ساڵی ١٩١٣ لە گۆڤاری ڕۆژی کورد بلاوکراوەتەوە) .

ئەمەی سەرەوە بەرکولێکی باسەکەی کاك ازاد هۆشمەند بوو کە لە ڕۆژی ٩٨٦/٣/٢٥ بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە هۆڵی ڕۆشنبیری‌دا ، کۆڕێکی ڕەخنەیی لە ژێر ناونیشانی (چیرۆکی سێکسی‌ی کوردی ١٩٤٥-١٩٨٥ لە تای تەرازووی زانستی‌و کوردەواریدا) سازکرد . دەتوانین باسەکەی کاك ازاد بەم جۆرەی خوارەوە دابەش بکەین :

- پێشەکی
- چیرۆکی سێکس‌و تەوژمی فرۆیدیزم
  - ساڵانی ١٩٥٠-١٩٦٠
  - ساڵانی ١٩٦٢-١٩٦٩
  - ساڵانی ١٩٧٠-١٩٨٥
- سێکس‌و زانست
- ئافرەتی کوردو ڕەوشت‌و سێکس
- پێداچوونەوەیەکی خێرایی ، لەم بەشەیدا چەندان نموونەی هێنایەوە ، وەك :

- چیرۆکی دادگاهی سەرچنار - مامۆستا شاکر فەتتاح .
- چیرۆکی دەروازەگەڕ - عەبدوڵلا میدیا .
- مام هۆمەر - موحەرەم محەمەدەمین .
- قینی لێم‌بوو - محەمەد مەولوود مەم .
- بێگانەیەکی چەتاوە روو - جەلال مەحمود عەلی .
- لە ڕێی داوێن پاکی‌دا - محەمەد مستەفا کوردی .
- دەنگێك لە تاریکی‌دا - ئەکرەم قەرەداخی .
- مەیکوتە چەوتە - جەمال بابان .
- نازە - ئیسماعیل ڕۆژبەیانی



- گیانی مەردی – عەبدوڵلاّ عەزیز خالد .
- تروسکەی هیوا – حەسیبە .
- سۆنە – جیهان عومەرو چەندانی تر .

● کاك ازاد هۆشمەند لە ساڵی ١٩٦٢دا لە شاری کەرکوك لە بنەماڵەیەکی خانەدانی هەمەوەند لە دایك بووە .

● سەرەتایی خەبات‌و ناوەندی باوەگورگورو ئامادەیی کوردستانی هەر لەم شارەدا تەواو کردووە .

● ساڵی ١٩٨٣ لە زانکۆی صلاح‌الدین کۆلێژی زانستی بەشی جیۆلۆجی وەرگیراوە .

● لە ناوەراستی حەفتاکانەوە کلکڵەی ئەدەب‌و نووسینی کەوتووەتە کەللەیەوەو لە مەیدانی چیرۆکنووسین‌دا ئەسپی خۆی تاوداوە .

● کۆمەڵە کورتە چیرۆکێکی بە ناوی – ژانی دایك‌و ژانی چیاکان – ئامادەیە بۆ چاپ .

● لە حوزەیرانی ١٩٨٥دا لە کۆری شیعری کوردیەی شاعیرە لاوەکانی کەرکوك‌دا لێکۆڵینەوەیەکی بە پێزەی بە زمانی عەرەبی خوێندەوە بە ناوی (قافله الشعر الكردي و تطور الفكر و المجتمع) .

## فۆلکلۆری کوردی

کۆلێجی پەروەردە – بەشی زانستی دەروون لە رۆژی ١٩٨٦/٣/١١ لە هۆڵی کتێبخانەی کۆلێجەکەدا کۆرێکی بۆ قوتابی عومەر ئیبراهیم عەزیز بە ناونیشانی (فۆلکلۆری کوردی لە روانگەی زاناو رۆژهەلاتناسان‌و نووسەرانی کوردەوە) سازکرد . لە سەرەتاوە مامۆستا ئەحمەد عارف بەخێرهاتنی ئامادەبوانی کردو گوتی (کاك عومەر نووسەرەو برایەکی قوتابی ئێوەیە لە خوێندن‌و پێویست بە پێناسی ناکات چونکە لای هەمووتان ئاشکرایە کە کاك عومەر لە بواری خزمەت‌کردنی فۆلکلۆری کوردی دریغی نەکردووە ، وابزانم ئەمە کۆری دووەمیەتی پێشکەش دەکات لەناو ئەم کۆلێجە لە ساڵی خوێندنی ٩٨٥–٩٨٦ ، کە ئەوی‌تریان بە زمانی عەرەبی بوو ، بەلاّم ئەمرۆ لەم کۆرە بە یەك دەگەینەوە کە بیروڕای پتر لە (٣٩) زاناو رۆژهەلاتناس‌و نزیکەی (١٥) نووسەری کورد کە بیروڕایان بەرامبەر بە فۆلکلۆری کوردی دەربڕیوە) .

دوا بە دوای ئەمە کاك عومەر هاتە سەر باسەکەی‌و پەنجەی بۆ مانای فۆلکلۆرو سەرهەڵدانی درێژکردوو مێژووی فۆلکلۆری بەسەر سێ قۆناغ دابەش‌کرد :

● قۆناغی یەکەم : لە سەرەتای مێژووەوە تا سەدەی نۆزدەهەم ، لەم قۆناغەدا مێژووناسە گەورەکان گەلێك خوو رەوشت‌و باوەرو ئەفسانەو هونەرو زانیاری سەربەخۆیان کردووە .

● قۆناغی دووەم : قۆناغی زانیاری لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ، زانیاری زمان‌و کۆمەلاّیەتی پەیدابوو .

● قۆناغی سێهەم : فۆلکلۆر خرایە شێوەو شێوازو بنچینەی زانیاری‌یەوە .

ئینجا باسی رۆژهەلاتناسەکانی کردوو نێوی هێندێکیانی هێنا وەك : ئەلبێرت ، پریم ، دیتیل ، ئۆسکارمان ، لێرخ ، مار ، هۆگۆماکاش ، لیسکۆ ، بەرلینەرو بورخارد ، کارل هەدانك‌و چەندانی تر .

دوا بە دوای ئەمە بیروڕای چەند نووسەرێکی کوردی عێراقی دەست نیشانکرد لەوانە : مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ، علاءالدین سەجادی ، پرۆفیسۆر د . عزالدین مستەفا رەسول ، د . شوکریە رەسووڵ ، خوالێ‌خۆشبو ووردی . عومەر شێخ‌الله ، ئەسعەد عەدۆ ، محەمەد کریم شریف ، ممتاز حەیدەری ، مەحمود زامدار ، اسماعیل رسول‌و چەندانی‌تر .

ئینجا باسی چاپکراوە فۆلکلۆری‌یەکانی کردوو دەستی بۆ بیبلۆگرافیای مامۆستا نەریمانی کرد ، لە کۆتاییدا چەندان مامۆستاو قوتابی گفتوگۆی باسەکەی کاك عومەریان کرد .

## پیشانگای سێهەم

بە چاودێری بەرێز ئەحمەد. نەقشەبەندی سەرۆکی



ئەنجومەنی یاسادانان ، بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەولێر . پیشانگای سێهەمی بۆ بەشە پیشەیی‌یەکان لە ڕۆژانی ٢٥-٢٧/٣/٩٨٦ لە هۆڵی قوتابخانەی ناوەندی کۆماری کوراندا سازکرد . ئەوەی شایانی باسە پیشانگای یەکەم لە (٧)ی نیسانی ١٩٨٤داو دووەمیشیان لە (٢٨)ی نیسانی ١٩٨٥دا لە هەولێر سازکراوە . سەرەڕای ئەمەیش ناوەندی کۆمارو سەیداوە لە دوو پیشانگای‌تر لەسەر ئاستی وولآت لە بەغدا بەشداریان کردووە . بەلآم ناوەندی برایی بۆ یەکەم جارە بەشداری ئەم پیشانگایە دەکات .

| ناوی قوتابخانەکان | بەشەکان | لێ‌پرسراوانی بەشەکە |
|---|---|---|
| – ناوەندی نضال | دارتاشی ، وێنە ، کارەبا ، مەعادن . | امام حمد قاضي |
| – ناوەندی گارە | مەعادن ، وێنە ، کارەبا ، سیرامێك ، چنین . | صبری رسول |
| – ناوەندی سەیداوە | دارتاشی ، وێنە ، کارەبا ، سیرامێك ، مەعادن . | رفعت جواد |
| – ناوەندی کویسنجق | مەعادن ، وێنە ، چنین دارتاشی . | دیاری احمد فتحیّ |
| – ناوەندی برایی | مەعادن ، دارتاشی ، کارەبا ، وێنە . | عمر فارس محمد |
| – ناوەندی شەقلاوە | دارتاشی ، میکانیك ، وێنە ، کارەبا ، چنین . | قاسم قادر رشید |
| – ناوەندی چنار | چنین ، کارەبا ، وێنە ، مەعادن . | ژیان حمد معروف |
| – ناوەندی کۆمار | مەعادن ، کارەبا ، وێنە ، سیرامێك ، دارتاشی . | ادەم مەولوود |

## یەکەم پیشانگای فۆلکلۆری

کۆلێژی پەروەردە لە زانکۆی صلاح‌الدین لە ڕۆژانی ٢٦-٢٨/٣/٩٨٦ پیشانگایەکی فۆلکلۆری تایبەتی بۆ قوتابی بەشی دەروون ناسی عومەر ئیبراهیم عەزیز لە هۆڵی کۆلێژی پەروەردەدا سازکرد . یەکەم پیشانگای فۆلکلۆری کاك عومەر لە شێوەی پیشاندان‌و کردنەوەی وەك هەموو پیشانگایەك نەبوو بەڵکو لە جیاتی شەریتی سوورو مقەس دۆڵ‌و زوورنابوو ! بەراستی سەرنج ڕاکێشەر بوو بە تایبەت بۆ ئەو مێوانانەی کە هێندە لە داب‌ونەریتی کوردەواری شارەزا نەبوون .

ڕەشماڵ‌و چیغ شوێنی دانیشتنی مێوانەکان بوو ، ئەم ڕەشماڵەیش بە کەل‌وپەلی فۆلکلۆری ڕازاندرابوو ، بینەرانی پیشانگا لەسەر زەوق خۆی چی بخواردبایەوە . . چایە ،

قاوە . ماستاو . سیگار . خۆ هەر کەسێك بیوستبا سواری جەنجەر بێ بۆی ئامادە کرابوو . هەر کیژۆلە جوانێکی ئەم سەردەمە حەزی لە مەشکەژەنی بکردابوایە ئەوە (پلکە) بەجیسی قەرەچووغی بەخۆیی‌و کەرەسەی مەشکە ژەنین لە ناوەراست پیشانگاکە راوەستابوو . خۆ باسی (نانی تیری)و سێلۆو نان برێشك‌و خوشکە زەرێخ کە دەتووت کابانی بنەماڵەیەکە لەبەر فەرشەکەی دانیشتبو وەك بلێی رۆژی بووك گواستنەوە بوو . ئەم کارە تاکە کەسیەیی کاك عومەر جێگای رەزامەندی هەموو بینەرێك بوو . پیشانگاکە بریتی بوو لە هەشت بەشی سەرەکی وەك : کشتوکاڵ ، نان‌دین ، مەرومالات ، دانەوێڵە ، وولاخ ، رەشماڵ‌و ناو رەشماڵ ، کەرەسەی هەمەجۆر .

کەل‌وپەلەکان بە گشتی : خرخاری زیو ، کیسە توتن ، کوتك ، تەوشی ، هەمبانەی ساواری ، خێدان ، دۆخین ، سەرکراو ، جەو ، گۆسکە ، کەوگیر ، مەسینە ، تێر ، جاجم ، درێشە ، گوریس ، رەشماڵ ، جۆنی ، لغاو ، کەژی ، زین ، مەشکە ، بێر ، کەور ، کووچاگر ، رەشکەی کایێ ، شەنە ، قەیناغ ، داس ، پیشەقان‌و دەیان کەل‌وپەل‌و ئامێری کوردەواری‌تر .

**پیشانگای تایبەتی**

بە چاودێری بەرێز محەمەد محی‌الدین جێداری ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری‌و لاوان ، دەزگای روشنبیری‌ی‌و بلاوکردنەوەی کوردی لە رۆژی ۱۹۸٦/۳/۳۰ لە هۆڵی مۆزەخانەی قەلای هەولێر پیشانگای سێهەمی هونەرمەند سەردار سنجاوی سازکرد . ئەم پیشانگایە بریتی‌بوو لە نزیکەی (۲٤) تابلۆی جوان‌و قەشەنگ کە جێگای سەرنج راکێشانی بینەران بوو . تابلۆکان ئەمانە بوون : بەرزبوونەوەی خودی مرۆڤ ، لە نیگای گوندێکەوە ، ژیانی رۆژانە ، روخسار ، داکشان بەرەو بەرزی ، مرۆڤ‌و چەندانی‌تر . ئەوەی شایانی باسە کاك سەردار پیشانگای یەکەمی خۆی لە ساڵی ۱۹۷۹ داو دووەمیش لە ساڵی ۱۹۸۳ دا کردۆتەوە ، هەروەها بەشداری پیشانگای هاوبەشی کردووە – ۱۹۸۲ – سەرەرای پیشانگای هونەرمەندانی گشت کورد – ۱۹۸٦ – کردوە ، ئێستایش قوتابی پەیمانگای تەندروستی بالای هەولێرە .

**ژ ئامادەکرنا : مەتین**

## ئەفسانەو شعرا هەڤچەرخ

ل ژێر دروڤیێ «پێکڤە ژ بو ئاڤاکرنا عیراقا مەزن» بچاڤدێریا پارێزگەرێ دهوکێ ، دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤکرنا کوردی کورانگەهەکا تورەیی بو سەیدایێ هوزانڤان تیلی أمینێ سازکر ل هولا چالاکیێت خاندنگەها ل دهوکێ رۆژا ۹–۳–۱۹۸٦ هژمارەکا باش یا رەوشەنبیرێت دهوکێ لێ ئامادەبون .

ژ رێڤە سەیدا مختار فائقێ گوتارەك بناڤێ دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤکرنا کوردی خاند .

«ئەفسانەو شعرا هەڤچەرخ» بابەتێ ڤی کۆری بو یێ کو سەیدا عبدالکریم فندی برێڤە بری .

ل پێشیا بابەتێ خوکاك تێلی پێناسینەك دا ئەفسانێ‌و رامان ژێ دیارکرو بیرو راییێت هژمارەکا پسپوریێت بیانی دەربارەی ڤێ چەندێ ئاشکراکرن . د دویڤدا بەحسێ ئەفسانێ د فولکلوریدا کرو بدرێژی لسەر هندەك رەمزێت ئەفسانەیی ل دەڤ کوردا ئاخڤت ژ وان رەمزا :

«خاجە عەلی ، میرزا مەحەمەد ، سیمەرخ ، پەری» ئەڤ رەمزە هێزێت پاشیێ‌نە ، گرفتاریێت خەلکی درست‌دکەت‌و کەسێ پێدڤی قورتال کرنێ ژ نەخوشییا قورتال دکەن .

دیسان رەمزێت هێزێت شەری هەنە مینا «دێو ، پیرهەڤ ،

ماریٚ حەفت سەر» . ئەڤنە بوینە رەمزیٚت ئەفسانەیی‌و ژ رویدانیٚت میٚژوویی زاینەو خویابوینە .

ژ لایەکیٚ دیڤە کاك تیٚلی دیاردکەت کو مەیدانا خەباتا نیشتمان پەروەریٚ فرەهترین مەیدانا ئەفسانەیی بو بو هوزانڤاناو ئەڤ رەمزە د شعریٚت خودا بکار ئینانیە .

ژ وان : «خانیٚ موکری – خانیٚ لەپ زیٚرین ، قازی محمد ، شیٚخ محمود ، پاشاییٚ گەورە . . هتد» . هەر وەها رەمزیٚت ئەڤینداروو دلدارییٚ‌و رەمزیٚت ژ کارتیٚکرنا ئولا بوسولمانەتییٚ خود ناڤ شعریٚ هلدانیە ژ رەمزیٚت لسەر ڤان بابەتا :

«مەم‌و زین ، فەرخ‌و ستی ، خەج‌و سیابەند» ، «صەبرا ئەیوبی ، تەیریٚ ئەبابیل» .

پاشی سەیداییٚ تیلی بناڤ بابەتی‌دا چو خاریٚ‌و لسەر خالیٚت ژیٚری پارڤەکربو :

(١) – بکار ئینانا ئەفسانیٚ د شعریٚدا : تبابەکی لسەر «الکومیدیا الألهیەو الألیاذەو داستا گلگامش ئاخڤت .

(٢) – الیوت‌و شعرو ئەفسانە : هندەك مالك ژ هەلبەستا عەردیٚ ویٚران کە باشترین شعرا الیوتی‌یە ژمەرا خاندن‌و بدریٚژی لسەر ئاخڤت .

(٣) – بدر شاکر السیاب‌و ئەفسانە :

کاك تیلی بو مە دوو هەلبەستیٚت ڤی شاعری ئینان‌و وەك‌و نمونە لسەر لاییٚت ئەفسانیٚ تیٚدا ، تبابەکیٚ ئاخڤت‌و بەلی کر کو سیاب ئیٚکەمین شاعریٚ عەرەبە ئەفسانیٚ بو شعرا هەڤچەرخ بکار دئینیت . پاشی ب بەرفرەهی باسیٚ وان رەمزا ییٚت کو سیاب پەنا بریە بەر ژ وان رەمزا : «سندباد ، قابیل‌و هابیل ، ئولیس» .

پاشی دەرفەت هاتە دان بو گێنگەشیٚ ، چەند برادەرەکا پشکداری تیٚدا کرن‌و هەر وەسا هژمارە پرسیارا ژی هاتنە کرن . ئەم دیٚ ل هیٚرە بکورتی ڤیٚ گێنگەشیٚ‌و ڤان پرسیارا دانینە بەر چاڤیٚت خاندەڤانیٚ هیٚژا :

(١) – صدیق شرو : سەیداییٚ تیلی ئەفسانەو ومەلحەمەو حیکایەو خورافە هەمی تیٚکەل کرن . پشتی مە ئەدەبیٚ بیانی خاندی مە د ئەدەبیٚ کوردیدا بو خو ئەڤە ڤاڤیٚرتن . لیٚ نەئەوە کو هە د ئەدەبیٚ کوردیدا نەبون .

ئەز دبیٚژم ئەفسانە د شعرا عەرەبیدا بسیابی دەست پیٚ‌ناکەت ، بەری وی هەبون دەست دڤیٚ چەندیٚ‌دا هەبو ، وەکی مازنی‌و عەقادی‌و ئلیاس ئەبو شەبەکەی ، لیٚ بەهرەوەری‌و داهینەریا سیابی دویٚ هندیٚ دابو کو وی ئەفسانە بتەحلیا ژیانا خوڤە گریٚدا .

● – تیلی امین : ئەڤە هەمی یەك بابەتن‌و یەك دگرن‌و ئەم نەشیٚین ژ هەڤ ڤاڤیٚرین ژبەرکو نەماریٚ مەیەو هەتا نهو ژی هەر وەکی مە ل پیٚشیٚ گوتی چ پیٚناسین بو ئەفسانیٚ نینن . خالا دوویٚ راستە بەری سیابی هەنە ئەفسانە بکار ئینای ، شەوقی ژی بکار ئینایە ، لیٚ وەکو بابەت‌و کویراتی‌و بژیانیٚ‌ڤە گریٚدان ، کەسیٚ بەری سیابی دەست نەهاڤیٚتییٚ‌و وەکی وی بکار نەئینایە د شعرا خودا .

● – پ/ سەیدا تە بۆچی بەحسیٚ رۆستەمیٚ زالٚ نەکر ؟

● – تیلی : سوپاس بو برادەری براستی من ژبیرکر ، بەلیٚ ئەم نزانین کەنگی پەیدا بویە .

● – حجی جعفر : سوپاس بو کاك تیلی کو بزمانەکیٚ قەشەنگ شیبا گوتارا خو بو مە پیٚشکیٚش بکەت . راستە بزەحمەتە ژیٚك ڤاڤیٚرین «واتە ڤاڤیرینا ئەفسانیٚ وحیکاییٚ‌و مەلحەمیٚ» لگەل هندیٚ خەلکی ییٚت بو خو ڤاڤارتین . ئەڤیٚت سەیدا گوتین هندەك ژیٚ «بیرو باوەریٚت مللینە» معتقدات شعبیە ، ئەم دشیٚین ڤان ژ ئەڤیٚت دی جودا بکەین دیسان مەلحەمە ژی یا دیارە . ئەز ل دوماهییٚ دبیٚژم خوزیکا سەیداییٚ تیٚلی پشکا دوویٚ ژگوتاریٚ خو خاندبا ل ڤی کۆری «اسطورە د شعرا کوردیدا» پاشی جارەکا دی د دەلیڤەکا دیدا بابەتیٚ ئیرو بو مە گوتبا .

ئەڤەو هیٚژاییٚ موحازر بەرسڤیٚت خو ب دریٚژی دان‌و ب

